ناوی کتێب: ئازاد بوون لەدەریا، نوقومبوون لەزیندان
نووسەر: چیا هاوار
بابەت: بەسەرهات
هەڵەبڕی: باڵا هاوار
دیزاینی ناوەڕۆك و بەرگ: ئاکام شەمسەدینی
تیراژ: ۱۰۰۰دانە
چاپخانە: چاپخانەی ئەحمەدی - تاران
ساڵی چاپ: ۲۰۲۰
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (۱۹۱۷)ی ساڵی (۲۰۲۰) پێدراوە

## پێشکەشە:

- بەدایکی ئازیـزم، دڵنیـام هیـچ کاتێك ناتوانـم قەرەبووی ئازارەکانـی بکەمـەوە کـە بەهـۆی مـن چەشـتویەتی.

- پێشکەشە بە (سافۆ)ی هەمیشە لەیادم.

- پێشکەشـە بـە رۆحـی ئـەو هاوڕێیانـەم کـە لەدەریـای ئیجـە، گیانیـان سـپارد و ئـەو هاورییانەشـم کـە وەك مـن رزگاریـان بـوو بەتایبـەت (کریفـۆ بەهـزاد و سـامان شـێخ رەئـوف).

- پێشکەشـە بـەو هاوڕێیانـەم کـە رۆژگاری سـەخت و دژوارمـان لـە زیندانـەکان بەیەکـەوە گوزەرانـد.

- سـوپاس بـۆ نووسـەری گـەورەی کـورد مامۆسـتا (شـێرزاد حەسـەن) کـە هـاوکار و هانـدەرم بـوو.

## تێڕامانێک

لە دێر زەمانەوە، لەوەتەی پیت/ حرف دۆزراوەتەوە و نووسین و تۆمار لە ئارادایە هەیە، نووسینەوەی ژیاننامە و یاداشتنامە و بیرەوەری برەوی هەیە و لە هەرمێندایە٠ لە سەردەمانێکی زووتردا ئەم چەشنە لە ژانر و ستایلە، بە تەنها شایستەی پادشاکان و دەستەڵاتدارانی کایەکانی رامیاری و هەم ئایینی و ئابووری و کۆمەڵایەتی بوو، نەك کەسانی ئاسایی و رەشۆکی، دیارە زانا و داناکانیش بۆیان هەبووە یاداشتنامەی خۆیان بڵاو بکەنەوە، بە تایبەتی ئەوانەی، کە لە بوار و کایەی زانستە مرۆییەکان و سروشتییەکاندا ناودار و دیار بوون، بەڵام لەم چاخە تازمیەدا گەلێك کەس کە کەسنەناسن و سەر بە چین و توێژی خوارەوە و گومناون، کەچی لە رێگەی نووسینەوەی ژیاننامە و بیرەوەری خۆیان بوون بە ئەستێرەی درەوشاوە، بگرە هەندێکیان پێی دەوڵەمەند بوون، وەك باری دارایی، بە تایبەتی لە "خۆرئاوا"دا٠

هەڵبەتە دوو سەرچاوەش زۆر گرنگن بۆ سەرکەوتنی ئەم تەرزە تۆمار و نووسینە: یەکەمیان ئەزموونێکی تێر و پڕ و دەوڵەمەند لەسەر ئاستی تاکەکسیی و هەم کۆمەڵایەتی، دووەمیان مەرجە نووسەرەکە لە باری فیکری و زانیارییەوە، بە گشتی، هەگبەکەی قورس بێت، سەرباری ئەوەش کە ئازایەتی و رەوانبێژی نووسەرەکە رۆڵی دەبێت لە سەرسامکردنی خوێنەرانی خۆی.

دیارە لای ئێمەی رۆژهەڵاتیی کە مرۆڤەکانی داخراون و نهێنیگرن، لە باری کۆمەڵایەتییەوە دادگایی دەکرێن گەر سەربەستانە گوزارشت لە خۆیان بکەن، هۆکاریش زۆرن کە لێروکانە ئێمە پتر بۆ ئەوانیدیکە دەژین و مەرجە لێمان رەزامەند و قایل بن، قەدەغە و بڤە و حەرامێکی زۆر گەمارۆی داوین کە ناتوانین خۆمان بین، "ژان پۆل سارتر" واتەنی: ئەوانیدیکە بۆ من بوون بە دۆزەخ!.

سەرباری ئەمەش راستگۆیی و خاکەڕایی یەکێکە لە رەگەز و پایەی سەرکەوتنی هەر یادەوەری و ژیاننامەیەك، کە دەبێت بە مایەی کۆکردنەوەی خەڵك و خوێنەران لە دەوری خۆی. هاوکات ناکرێت نووسەرەکە وەك سوپەرمان و پاڵەوان خۆی بنوێنێت و زێدەرۆیی بکات لە باسکردنی دراما و تراژیدیای بەسەرهات و رووداوەکان.

بە بەراورد لە تەك ئێمەدا "رۆژئاواییەکان" کراوەترن، هەڵبەتە ئەم کرانەوەیەش بە شەو و رۆژێك ساز نەبووە، ئەوانیش هەر وەکو ئێمە بوون، بەڵام بە جۆرەها شێوە هەوڵیانداوە کە کۆمەڵگایەکی کراوە بێننە کایەوە، کە تیایدا بنیادەمەکان وەك کەسانی تاکڕەو و

سەربەخۆ، نەك بە مانا رەهاییەکەی، چونکە من گومانم هەیە کە لە نێوهیچ جوگرافیایەکدا کەماڵی سەربەستی بە مانا مرۆیی و سیاسییەکەی بوونی هەبێت!

دوای خوێندنەوەی کۆی تۆمار و یاداشتنامەکەی "چیا هاوار" کە دەگرێت ناوی بنێین یادەوەری، ژیاننامە، نا-رۆمان یان بایۆگرافی بە لاتینییەکەی. خودی ئەم کتێبە گەشتێکە بە ناو رۆژگارێکی تاریك و ترسناکدا، دەستکردی ئەو زاتانەیە، کە تاوەکو ئێستاکێ خۆیان بە شۆرشگێڕ و قوربانیدەر دەبینن، ئەم دۆخەی کە نووسەری ئەم یاداشتنامەیە تێیکەوتووە، بە تەنها چیرۆکی ژیانی خۆی نییە، بەڵکو ژیانی چەندین هاوزمان وهاوڵاتی و هاوتوخمی خۆیەتی، کە لە تەمەنی جیاوازدا، دوچاری هەمان ئازار و مەینەتی بوون، رەنگە ئەم بەرهەمە یەکەمین پرۆژەی ئەم بێت، وەك بیستم کە لە ساڵی "١٩٩٨"دا بە موعجیزە و پەرجوویەك لە "زیندانی ئاکرێ" رزگاری دەبێت کە میکانیزمەکەی پەیوەست بوو بە پرۆسەی ئاشتیەوانی کە تیایدا ژمارەیەك لە زیندانی و دیلی جەنگی هەردوولا بە بەرامبەر ئازاد دەکران وەك نیازپاکی هەر دوو حیزبەکە، ئیدی دوای گەڕانەوە بۆ ژیانی ئاسایی خۆی، نووسینەوەی ئەم گەشتە خوێناوییەی دەبێت بە خەون و خولیای، کە هەنووکە وا لەبەر دەستی ئێوەدایە. بەڵام "چیا" خۆیشی زانیوییەتی کە فرمێسك و خوێن و ئارەقە و شەوانی خەوزڕان و خەونی خراپ و مۆتەکە و رۆژانی ئەشکەنجەدان بە دەستی هاوتوخم و هاوزمانەکانی خۆی،

دڵڕەقی و شکاندنی شکۆمەندی مرۆیی گەلێك زەحمەتە بچنە سەر کاغەز، هەر هەمان هۆکار و بیانوو وایکردووە کە پتر لە بیست ساڵ ئەم خەم و خولیایە لە ناو رۆحی خۆیدا هەڵبگرێت. من کە خوێندمەوە گومانم هەبوو کە شتێك هەبێت بە ناوی مرۆڤپەروەری لەم دەڤەرەی ئێمەدا کە من ناوم ناوە "ڕەشهەڵاتی ناوەراست"

چیرۆکی "چیا" لەو خەونەوە دەست پێدەکات، یان با بڵێین لە نائومێدی و تۆرانێکی کوشندەوە لەوەی ناکرێت ئەم وەك گەنجێکی خاکپەرست و خۆ بە مرۆڤ-زان بەشداری "شەڕی ناوخۆ" بکات و لە نێو ئەو کوشتارگایەدا خوێنی هاوزمانەکانی خۆی بڕێژێت، دیارە بە سەدەهایان لێ کوژران و کەمئەندام بوون، ژمارەیەکی دیکەشیان وەك "چیا" هیچ چارەی نەماوە بێجگە لە کۆچ و سەرهەڵگرتن رووەو هەندەران.

دیارە خودی بڕیاری کۆچ بڕیارێکی قورسە و پتر بەراورد دەکرێت بە دوور خستنەوەی منداڵ و تۆراندنی لە شیری دایکی، ئیدی جۆرەها شێواز و تێکنیك بەکار دەهێندرێت بۆ ئەوەی منداڵەکە لە سینە و مەمکی بتۆرێت، بە بیانووی هەراشبوون و فەراقەبوون، هەر خودی دایك لەتەك وێنەی نیشتمان، هاوشانە لەسەر ئاستی هەموو دونیا، دیارە وێنەی زان و زوور و ئازاری زان و لە دایکبوون و جیابوونەوە لەو منداڵدانەی کە کۆرپەکە تەواو ئارام و بێخەم بووە هاوشانی وێنەی جێهێشتنی زێدی خۆیەتی، یان دەشوبهێندرێت بە هەڵکەندنی نەمامێك و چاندنی لە شوێنێکی دیکە، کە رەنگە

خاکەکەی بە پیت نەبێت و سەوز نەبێت، هەندێکجاریش پتر لە مەرگ دەچێت، کە کەسی مردوو لە هەوڵی ئەوەدایە بە موعجیزە و پەرجوویەک زیندوو ببێتەوە.
هەڵبەتە هەستی "چیا" و هاوڕێکانی کە خۆیان رادەستی قاچاغچی دەکەن، زۆر جاران لە نێوان ژمارەیەک قاچاغچی دەستاو دەستیان پێدەکرێت، ئەو چیرۆکانەش زۆرە، کە بەشێکیان تەنها خەمی گیرفانی خۆیانە و بەس، هەموومان گوێبیستی ئەو تراژیدیا و درامایانە بووین، کە لەو رێگای "هاتوونەهات"ە دوچاری دەبن، هەڵبەتە خەونی گەیشتن بە بووکی ئاوروپا وایکردوە کۆچبەران مل لە تیغ هەڵبسوون.
هەڵبەتە مۆتیف و پاڵنەرەکانی کۆچ ئابووری و رامیاری و کۆمەڵایەتی و چەندین بیانووی دیکەیە کە بە گشتی ڕەوایە، مرۆڤیش بۆ خۆی بەشێکە لەو سروشتەی کە تیایدا کۆی گیاندارەکان بە گوێرەی وەرزەکان گەشت دەکەن، بەڵام بیانووەکانی جێگۆڕکێی مەردمگەل لە نێوان جوگرافیاکاندا زۆرتر و ئاڵۆزترە!.
ئەوەی کە لە ناوئاخنی ئەم بیرەوەرییەدا سەرنجی منی راکێشا ئەوەیە کە بەدەم ڕەوکردنەکەوە لە هەر گوند و شارێك، کە ناچارن پشوو بدەن و پلانی تازە دابنێن لەتەك قاچاغچییەکاندا، "چیا" بە چاوێکی کونجکۆڵ و مەراقدار لە دیاردەکان و کەسەکان ورد دەبێتەوە، نموونەی ئەو ماڵانەی کە داڵدەیان دەدەن، بە رۆحی دەروونناس و کۆمەڵناسێك لە هەڵسوکەوتی خەڵکەکەی ورد دەبێتەوە، کە بە

شێوەیەکی نائاکادیمی و خۆڕسکانە ڕەهەندێکی "سایکۆ-سۆسیۆلۆژی" تێدا دەبینم، وەسفەکانی بۆ پەیوەندی نێوان ژنەکان و مێردەکان و فەرزەندەکانیان لە ناو زۆرینەی خانەوادەکاندا پڕ بووە لە ستەم و بێدادی، دڵرەقی جاشە کوردەیل و جەندرمەکان، یان ئەو کوردە سیخوڕانەی کە کار بۆ پۆلیسی تورکیا و ئێران دەکەن، یان ئەو سیخوڕانەی کە لە زیندانەکان زمان لەو کەسانە دەدەن کە هەمان چارەنووسیان هەیە.

دیارە دەکرێت کۆی ژیاننامەکە بەسەر سێ چوار بەش دابەش بکرێت: نەخشەی کۆچی خۆی و هاوڕێکانی بە وشکانیدا، کە پڕە لە دەردەسەری و مەرگەسات، دەگاتە ئەوەی هەندێک جار بکوژرێن. دووەمیان کە دەبن بە سی و شەش سەرنشین و ئەمجارەیان ئیدی دەریای "ئیجە"بە هەموو ترسناکی ناوەکەی، هەمیشە ڕێگای مەرگ بووە، دیسانەوە هەمان چیرۆکە، بەلەمێکی شەق و شڕ و کون تێبوو، لە ناوئاخنی کۆی یاداشتنامەکەدا پانتاییەکی زۆری داگیرکردووە، جەنگی مەرگ و ژیان بووە و بە موعجیزە و پەرجوو کەشتییەکی رزگارکەر فریای ژمارەیەکی کەمیان دەکەوێت، ژمارە هەرە زۆرەکەی کە خانەوادەی زارۆکدار و گەنج و تەمەنداریشی تێدا بووە، دەبنە قوربانی دەریالووش.

قۆناغی سێیەمین، تیمی رزگارکەر و هەم ماس-میدیا و بەڵێنی سەوز و سووری چەند بەرپرسێك بەوەی ڕێزی تایبەتیان لێدەگیرێت، هەڵبەتە لەم وێستگەیەدا "چیا" و ژمارەیەك لە هاوڕێکانی

سنووررداش دەكرێنەوە، دیمەنێكی زێدە كارەساتبارە، تەرمی ژمارەیەك لە سەرنشینانی بەلەمەكە دەدۆزنەوە، مەرجە "چیا" و هاورێكانی بچنە سەر تەرمەكان بۆ ناسینەوەیان، دوای رزگاربونیان، چەند بەرپرسێكی كورد بەڵێنیان پێدەدەن، كە پێشوازییەكی شایستەیان لێبكرێت، لە باری واقیعیدا بێ بەڵێن دەردەچێت و هیچی لێ سەوز نابێت، چونكە هەر بە گەیشتنیان بۆ "زیندانی زاخۆ" و "ئاسایشی دهۆك" لە شكۆمەندیان دەدرێت و پێی بریندار دەبن.
دیارە دواتر دەگوێزرێنەوە "ئاسایشی هەولێر" لە یەكەم دیداردا بەرپرسێكی ئەو دەزگایە بە زمانێكی شیرین و خۆش دەیاندوێنێت، كەچی هەر هەمان رۆژ و دووای چەند كاتژمێرێك زۆر بێبەزەییانە داركاری "چیا" دەكات؛ بێگومان بە مەزەندەی "چیا" هۆكارەكە ئەوە بووە بەرپرسان زانیویانە سەرجەلەكەی خۆی و كەسوكاری سەلماندوویەتی سەر بە "یەكێتی" بوون، نۆزدە رۆژ لە كونجێكی تاریكی ژێرزەمینێك توندی دەكەن، سەرباری حەسیر مەیدانەكە.
دیارە لەوەدا یەكێتی و پارتی هەمان رەفتاریان لەگەڵ دیلی شەڕی ناوخۆ كردووە، دیارە ئەرشیفی ئەو رۆژگارە ماوە، چەندین بەڵگە و تۆماری بڵاوكراوە ئەم هەقیقەتە تاڵەیان دەرخستووە، لەسەر ئاستی ناوخۆ و رێكخراوە بیانییەكان.
پارادۆكس و تەوسەكە لەوەدایە "چیا" لە تاو ئەوە رێگای كۆچی گرتۆتە بەر كە بەشداری (شەڕی براكوژی) نەكات و بە نامرۆیی و ناكوردانەی زانیوە، كەچی لە دیلی جەنگ خراپتر مامەڵەی لەگەڵدا

کراوە، لە ئاسایشی "مەسیف"یش هەمان سزاخانە، لە "تورکیا" و لە زیندانی "ئەزمیر"یش هەمان چەرمەسەری تووش هاتووە، بگرە لە رۆژی "جارنامەی مافی مرۆڤ"دا "چیا" و ژمارەیەك لە زیندانییەکان ئەشکەنجەیەکی کوشندە دەدرێن، سەرباری تۆمەت دروستکردن بۆ بەندییەکان لە هیچەوە، تەنها زمانلێدانی سیخوڕێکی ناو زیندان، هەتا گەر راستیش نەبووبێت، بەس بووە بۆ تێلاترێنکردنیان، لە ئاکامدا خۆکوشتن و خۆسووتاندنی تێکەوتووە.

خۆ ئەگەر ژمارەیەك لە بەندەوارەکان سکالانامەیان بۆ " خاچی سوور" بنووسیایە، خودی سکالاکە دەگەیشتەوە ناو چنگی بەرپرسە بالاکانی زیندان، ئیدی ئەو زاتانەی خاوەنی سکالانامەکان بوون، دوچاری سزا و ئەشکەنجە دەبوون، رێك وەك ئەوە وایە، خودی ئۆفیسی "مافی مرۆڤ" و گروپی "خاچی سوور" خۆیان لەگەڵ زیندانییەکان ناپاك بووبن!

دیارە دوا هەوارگەی نووسەر"زیندانی ئاگریّ" بووە، ئیدی من ئەو زیندانەم بیر کەوتەوە، لە رۆمانی "رۆژهەلاتی ناوەراست"ی دکتۆر "عەبدولرەحمان مونیف"دا هەیە و وێنای دەکات، دیارە زیندانییەکانی عێراق و سەردەمی "بەعس" و هەم کۆی جیهانی عەرەبی دەگرێتەوە، بێ حیکمەت نییە رۆمانەکەی بە تایتڵی "رۆژهەلاتی ناوەراست" بلاو بۆتەوە، گوایە نووسەر سەرەتا ئەندامی حیزبی "بەعسی" بووە، بەلام کە زیندانەکانی عیراق دەبینێت، ئیدی وازیان لێدێنێت و دەبێت بە ناحەزیان!.

بە درێژایی ئەم بیرەوەرییە پشوویەك دێتە پێشێ، ئەویش ئەو کاتەیە "واشنتن" ئاشتیەوانی بەسەر هەردوو بەرەی دژ بە یەکتری دەسەپێنێت، گەرچی زۆر خاووخلیچکە، بەڵام دەبێتە جێگەی سووکە ئومێدێك بۆ چیا و زیندانیانی سەر بە یەکێتی و پارتی کە سەرفراز بن.

ئەوەی، زۆر باوە و بگرە خودی کەسانی لیبراڵ و ئازادیخواز، کە ئەندامی کارای ناو پارتی و یەکێتی بوون، لە میانەی چەندەها بۆنە و دیداردا دانیان بەوەدا ناوە هەر زوو لە سەرەتای راپەڕینەوە ژمارەیەکی نادیار لە بەرپرسان و دەستەڵاتداران زیندانی تایبەت بە خۆیان هەبووە، بگرە هەندێکیان ژێرزەمینی باڵاخانەکەی خۆیان کردووە بە بەندیخانە و سزاخانە!.

تاوەکو ئێستاکێ لە "ڕەشهەڵاتی ناوەراست" بەردەوامە. دیسانەوە تەوسەکە لەوەدایە ژمارەیەکیان گوایە پاسەوان و بەرپرسی زیندانەکانن و خۆیان بە موسڵمانی عەیار بیست و چوار دەزانن، زیندانییە نوێژنەکەرەکان سزا دەدەن بە بیانووی ئەوەی خودانەناسن!.

لە راستیدا دەکرێت ئەم بیرەوەری و یاداشتنامەیە بەڵگەنامە و "پرۆستێتۆ" و سکاڵانامەیەکی مرۆڤپەروەرانە بێت دژی ئەو دۆخە نامرۆییانەی، کە لە زیندانەکانی کوردستان تا هەنووکەش بەردەوامە، لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بە تەنها مەبەستم زیندانییە سیاسییەکان نییە، بەڵکو کۆی زیندانە مەدەنییەکانیش، کە هەلومەرجی مرۆڤپەروەرانەیان تێدا نییە یان

وەك ستانداردی جیهانگیری دەگمەن و کەمە.
دواجار "چیا" و هاوڕێکانیان وەك دیلی جەنگ لە تەك زیندانیان و دیلەکانی بەرەی بەرامبەر ئاڵوگۆڕیان پێدەکرێت، دوای چاوەڕوانییەکی مەرگهێن و کوشندە. هەڵبەتە چاوەڕوان دەکرێت وەك زیندانی سیاسی مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، بە تایبەتی دوای دیدارەکەیان لەگەڵ "مام جەلال"دا، بەڵام هەر زۆر زوو بەرپرسێکی باڵای "یەکێتی نیشتمانی" مژدەی دەداتێ کە "چیا هاوار" دڵی خۆی خۆش نەکات و وەك "زیندانی سیاسی" مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، "چیا" ئەم بڕیارە دەگێڕێتەوە بۆ ململانێی نێوان باڵە جیاواز و ناکۆکەکانی ناو خودی "یەکێتی" کە بە "تەکتۆل" ناوزەد کراوە و تا هەنووکەش ماوە و بەردەوامە.. خەرمان بەرەکەت!.
ئەو هەستی نائومێدی و بێ ئەمەکییەی حیزبەکەی لەسەر زمانی بەرپرسێکەوە کە "چیا" لەم تۆمارەدا دەیهۆنێتەوە، لە دیدگای خۆی زۆر کوشندەتر و جەرگبڕترە لە ژیانی ناو زیندانی "ئاکرێ"، گەرچی هەر هەموو هاوڕێکانی وەك خەڵات و پاداشت و قەرەبووکردنەوە زەویان پێدەدرێت و هەم وەك فەرمانبەر دادەمەزرێن، بێ ئەوەی بەرگری لە "چیا"ی هاوسەنگەریان بکەن، کە ناکرێت بەم تەرزە سپڵەیی و ستەمی دەرهەق بکرێت!.
لە کۆتایی یاداشتنامەکەدا "چیا" پتر گومانی لە کۆی تێکۆشان و دروشمەکانی شۆڕش و مۆڕاڵی بەرپرسانی حیزب هەیە، بە بڕوای "چیا" شەڕی هەنووکە لەسەر پۆست و پارە و خواستی

پتـری وەدەسـتهێنانی دەسـتەڵاتە بـە مانـا سـتەمکارییەکەی و دوور لـە خۆشگوزەرانی و سەربەستی خەڵکانـی ستەمدیدە، کە ببـوون بـە پشـکۆی شـۆڕش و هەنووکـەش سـووتماك و خۆڵەمێـش!.

بەرمیلێـك نـەوت لـە بەرمیلێـك خوێـن بەهـای زۆرتـرە. تاوەکـو ئێستاش "دێگەڵە" سنووری سووری نێوان زۆنـی سەوز و زەردە، (٣٠) سی سـاڵ بەسـەر ئـەم رووداوانـەی نـاو ئـەم کتێبـە تێپەڕیـوە، کەچـی کـە مایکرۆفـۆن لەسـەر جـادە و کـۆڵان و ماڵـەکان خەڵکـی دەدوێنێـت، بـە دەگمـەن هاوڵاتییـەك دەدۆزینـەوە، کـە بـە زمانێکـی تـاڵ قسـە نـەکات و ئاسـۆی دەمکـەل بـە تاریکسـتان نەبینێـت!.

بـە راسـت.. مـن لـە یادمـە، کـە کـۆچ و کـۆڕەوە ملیۆنییەکـەی سـاڵی (٢٠١٥) دەسـتی پێکـرد. لـە نـاو تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکانـدا دەمخوێندەوە کە نووسـرابوو: "بەجێهێشـتنی ئـەم وڵاتـە ئەرکێکی نیشـتمانپەروەرییە"، یـان "هیـچ شـتێك نییـە مـن بـەم وڵاتـە ببەسـتێتەوە؛ بێجگـە لـە پێڵاوەکانـم"، یـان "ئـەم نیشـتمانە جووتێـك پێـڵاو ناهێنێـت کـە مـن پێخـواس بـم و بـە پێـی پەتـی بگەڕێـم"، ژمارەیەکی زۆری ئـەم رسـتە تووڕانـە هـی شـاعیری سـووریایی "موحەمـەد ماغـوت"ن.

سـەدەها رسـتە و دەسـتەواژەی شـەرمهێن و دڵپـڕوکێـن، وەلـێ بێسـوودە ئـەو کاتـەی دەسـتەڵاتداران لـە تێریـان خەوتبـن!.

"چیـا" بـڕوای وایـە کـە لـە هەنووکـەدا "ئیرهابـی فیکری" لە کوردسـتان بەرکەماڵـە، کـە هەمـووان دژی هەمووانـن، بـەڵام کـوا "فیکـر" لـەم وڵاتـەدا هەیـە تاوەکـو شـەڕی خۆیانـی پێبکـەن؟ ئـەوەی دەگوزەرێـت

لەسەر ئاستی رامیاری و کۆمەڵایەتی بەتاڵبوونەوەی خودی ژیان و دونیای ئێمەیە لەسەر ئاستی رامیاری و ئاکادیمی و کۆمەڵایەتی لە فیکر و مەعریفەت، کە رۆژ بە رۆژ پتر دەبێت بە سارا و بیابانی قاقڕ، ماس-میدیایەکی ساختەبازیش هاتووە بە بەهەشت پێمانی دەفرۆشێتەوە!

شەڕەکە شەڕی پێترۆ دۆلارە و مشەخۆری و بەرخۆری و هەرزانفرۆشی خەڵك و خاك و خەونەکانە پێکەوە.. هەر هەنووکە و لێرەدا.

کۆچ و رەوکردنیش بەردەوامە و وا زوو ناوەستێت، گرفتێکی گەورە نییە، کە دەستەڵاتداران و سەرانی ئەم شانشینە، شانشین بەو وێنە و مانایەی ئەوانی سیاسەتباز و سەرمایەدار دەیبینن، نەك من و تۆ و خەڵکە رەشۆکی و ستەمدیدەکان.

دیارە بۆ وەرگرتنی متمانە لە خوێنەران نووسەرەکەمان هەوڵیداوە بەشێك لە بەڵگەنامە و دۆکیومێنتەکان وەك پاشکۆیەك بەم یاداشتنامەیەوە بلکێنێت و ئامادەشە بەرگری لە راستی قسەکانی خۆی بکات، کە بە موو لە دروستی و هەقیقەتی لانەداوە، خۆ ئەگەر کەسانێك هەبن، دڵنیان کە ئەم بیرەوەرییە تاڵ و تاریکە هەڵبەستراوی نووسەرەکە خۆیەتی، وا گونجاوتر و شارستانی و رەوشتمەندانەیە، کە پێچەوانەی ئەوەی کە لەم کتێبەدا تۆمار کراوە، کەسانی لێوەشاوە و راستگۆ و ئازادیخوا هەڵیبوەشێننەوە، هاوکاتیش بە بەڵگەوە بیسەلمێنن، کە ناهەقی و زێدەرۆیی لە خۆی گرتووە.

ئەوسا دەکرێت خودی "چیا هاوار" بە ئاشکرا "پەشیماننامەیەك

بنووسێت، کە من دڵنیام ئامادەیە و جوامێرانە دەیکات!٠
لە کۆتاییدا "چیا هاوار" پرسیارێکی "هاملێت" ئاسای هەیە، کە شانۆگەرییەکی "شێکسپیر"ە ئەویش ماندووە بەدەست وڵاتی "دانیمارك"ەوە، کە نوقمی گەندەڵی و دارزانی ئەخلاقی بووە، هەڵبەتە لە سەردەمانێکی دێریندا، "هاملێت" بڕوای وایە، کە ئەم کەوتۆتە ناو سەردەمێکی وا گەنیو، ئیدی مەرجە و لە ئەستۆی ئەودایە، کە ئەو دونیا نارێك و پیسە، سەر لە نوێ پاك و هەم رێك بخاتەوە، بۆیە لە تاو زەخم و قورسایی ئەم ئەرکە مەحاڵەدا، لەو رۆژگارەدا، کە خیانەت وەك درمێك شانشینەکەی خواردووە، ئیدی رستە ناودارەکەی لە زار دەکەوێتە خوارێ، کە دەبێت بە پەندی زەمانە و هەموو سەردەمەکان:
" ئاخۆ دەبوو من هەبم یان هەرگیزاوهەگیز نەبوومایە؟ ئەوەیان کرۆکی کێشە و گرفتەکەیە!"
"چیا"ش دەپرسێت و راماوە:
" ئایا من زووتر لە وادەی خۆی هاتمە دونیاوە یان زۆر درەنگتر بوو لەوەی کە بهاتمایە؟!"

**" شێرۆ-ی پلکە زارێ"**

**شیرزاد حەسەن**

**گەلاوێژی/٢٠٢٠**

ئەودەمە، وڵات سوتماکێکی بۆن ناخۆش و خاکێکی بێزارکەر بوو، بۆنی بارووت و گرمەی هاوەن و دۆشکا کاس کاسی دەکردم، گرتن و راوەدونان و راکەڕاکی سەرکەوتن و شکان لەبەرامبەر یەکتردا هێزی بەکەسەوە نەهێشتبوو، جگە لە باس و خواسی شەڕ هیچ گفتوگۆیەکی تر لە نێوان هاوڵاتیاندا ئاڵوگۆڕ نەدەکرا. هەر رۆژە و لەشار و لادێیەك بنەمان دەخست و پێیان دەوتین ئاوارە! هەموو ئاواتمان ئەوەبوو چەند ساڵێك لەشوێنێکدا بە ئاسوودەیی ژیان بەسەر ببەین، هەمیشە لە بیری زێدی خۆماندا بووین، ژیان وابوو نەماندەزانی رۆژێکی نوێ لەکوێ دەبین و چارەنووسمان چی دەبێت؟!.

ئەو ژیانە ئاوارەییەی ئێمە بوبوە ژیانێکی ئاسایی، چونکە بەهۆی پێشمەرگایەتی باوکم لە پێش راپەڕینیشدا ئێمە هەروا دەژیاین و هەر چەند مانگ ماڵمان لە شاخێك یان لادێیەك بوو. ئەودەمە دەسەڵاتداران پارەیان لەهیچ پڕۆژەیەك خەرج نەدەکرد و ئەوەی دەستیان دەکەوت دەکرایە خەرجی جەنگ، بۆیە شار

و لادێ جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو، شارەکان بێ کارەبا و بێ سوتەمەنی و بێ خزمەتگوزاری بوون، لادێکانیش هەروابوون و وێرانە تریش. ئاخر ئەو سەردەمە شەڕ بوو، شەڕێك کە برا بەدەستی برا خەڵتانی خوێن دەکرا و دواتریش لە لایەك ناوی دەنرا شەهید و لە لایەکەی تریش پێی دەوترا بە سزای گەل گەیەندراوە. هەندێك قوتابخانە و کۆنە سەربازگە کرابوون بە زیندان بۆ گەنجانی ئەم وڵاتە، شێوازەکانی ئەشکەنجەدان لەو زیندانانە جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبوو لەگەڵ زیندانی دوژمنانی کورد، لە هەندێك زیندانیشدا ئەو کەرەستانەی ئەشکەنجەدان بەکار دەهێنرانەوە کە بەعس دوای خۆی جێی هێشتبون. ئەو سەردەمە باس و خواسی نێو خەڵك داستان و شەڕەکانی کەپکی حەمەد ئاغا و کلاو قاسم و سەفین و مامەڕووت و کۆلیتار بوو. باسی رەشیدی و قارەمانی خەڵك دەکرا، پێناسەی باشی ئەوسا ئازایەتی بوو لەشەڕ، شەڕێك، کە براکان هەوڵیاندەدا یەکتری خەڵتانی خوێن بکەن و یەکتری بسڕنەوە، کەرەستەکانی خۆ هەڵکێشان دەمانچە و مزەللی و مەخزەنی حەفتاوپێنجی بوو، ئەوەی چەکی بیکەیسی و شریتی گوللەکانی راست و چەپ لەخۆ دەئالاند، ئەو کەسە قارەمانی داستانەکان و ناو خەڵکی بوو، لە خەیاڵدانی هەرکەسێکدا جگە لە شەڕ و یەکتر راونان هیچی تر نەبوو. سالانێك بوو براکان بەیەکدا هەڵپژابوون، لە یەکتریان دەکوشت و درێغیان نەدەکرد لەگرتن و راوەدوونانی یەکتری، هەر رۆژە

و داستانێکی نوێ تۆمار دەکرا، ئێواران لەشاشەکانی تەلەفزیۆنە حزبییەکانی ئەوسا تەنها وێنەی مەیدانی جەنگ نیشان دەدرا و شەڕ و پێکدادان و تێکشکاندن و هێرشی راگەیاندن هیچ بۆشاییەکی نەهێشتبۆوە بۆ بیرکردنەوەی خەڵك لە ژیان. بێگومان ئەو شەڕە رەگ و ریشەیەکی مێژوویی هەبوو، لەناوەڕاستی سەدەی رابردوو و بگرە زووتریش سەری هەڵدابوو، بۆیە ئەوانەی ئاوڕیان لە مێژوو دەدایەوە، دەیانزانی کۆتایی هاتنی ئەو شەڕە ئەستەمە و رەنگە بەم زووانە کەس نەیبینێ.

ئەو سەردەمەی من باسی لێوە دەکەم مێژوویێکی زۆر دووری ولاتەکەم نییە، ئەوە چیرۆك و خەیاڵی رۆماننوسێکیش نیە، ئەوە سەردەمێك نیە، ئەوانەی لەوکاتدا ژیاون، ئێستا لەژیاندا نەمابن، بەڵکو باسی کۆتاییەکانی سەدەی رابردوو دەکەم، کە دوو دەیەی لێ گوزەراوە. باسی ئەو سالانە دەکەم، کە سەدان گەنجی ولاتەکەم، دەیان خێزانی نیشتمانەکەم ژیانی خۆیان دایە دەست قەدەر و لە داخی شەڕ و پێك هەڵپڕژان و براکوژی، لەداخی ناعەدالەتی و نەبوونی متمانە، لەداخی گوێنەدانی دەسەلات بە میللەت و لەداخی ماڵوێرانبوون و ئاوارە و دەربەدەربوون، لەداخی پەنابردن بۆ ولاتانی دراوسێ و بێ نرخ کردنی مرۆڤ سەری خۆیان هەڵگرت و ولاتیان بەجێ هێشت، رۆیشتن و ویستیان مەملەکەتێکی تر بکەنە نیشتمانی خۆیان، ئەوەی گەیشت ئەگەر ئاسودەش نەبوبێت بەلام هەڕەشە لەسەر ژیانی نەما، لانی کەم هەستی بە مرۆڤبوونی

خـۆی بـۆ گەڕایـەوە٠ ئەگەرچـی ڕۆیشـتنی ئەوانیـش سـەخت بـوو، بڕیاری جێهێشتنی کەس و کار و وڵات بڕیارێکی هێنـدە ئاسان نیـە، کـەم کـەس دەتوانێـت بڕیـاری لـەو شـێوەیە بـدات، بـەڵام وەك باسـم کـرد وڵات کرابـوو بـە مەیدانـی جەنگێـك، کـە هیـچ کەسـێك پێی ڕازی نەبـوو، چونکـە بەهـۆی شـەڕی براکوژییـەوە سـەدان کـەس ژیانیـان لەدەسـتدا و هەزارانـی تریـش بونـە قوربانـی بـە کەمئەنـدام بـوون و ئـاوارە بـوون و لەدەسـتدانی داهاتـووی خۆیـان و خێزانیـان٠ شـەڕی براکـوژی تـەڕ و وشـکی پێکـەوە سـوتاند، ئـەو برایانـە هێنـدە بـێ بەزەیـی بـوون، کـە سـڵیان لـە کوشـتنی یەکتـر نەدەکـردەوە لەپێنـاو باڵادەسـتبوون لـە گـرد و تەپۆلکەیەکی ڕوت و ڕەجـاڵ، ئـەوان درێغیان نەدەکـرد لـە سـوتاندنی مـاڵ و خانـوو و زەوییـە کشـتوکاڵییەکانی یەکتـری، گوێیـان بـە یاسـاکانی جەنگیـش نـەدەدا، ئـەوەی باسیشـی لێـوە نەدەکـرا مافـە سـەرەتاییەکانی هاوڵاتیـان بـوو٠

لـەو سـەروبەندەدا بـوو لـە بەرەبەیانێکـدا هێـرش کرایـە سـەر دێیەکەی ئێمـە، لـە هەمـوو لایەکـەوە ئاگـر بەسـەر دێیەکەمانـدا بـاری، شـەڕ هێنـدە گـەرم بـوو لـە جەنگـی نێـوان عێـراق و ئێـران دەچـوو٠ ئێمـە جەنگـی عێـراق و ئێرانیشـمان بینیبـوو، چونکـە دێیەکـەی ئێمـە نزیکـە لـە سـنوری ئێـران، جەنگێکـی قورسـی ئـەو دوو وڵاتـە بەشەڕهاتووەشـمان بـاش لەبیرمـاوە و زۆربـەی شـەوەکان لەسـەر بانـی ماڵەکانمانـەوە لـە شـاخی کـۆدۆ و گردمەندیلـی سـنوری باشـور و ڕۆژهـەڵات ڕادەمایـن، کـە زیاتـر لـە فیلمـە سـینەماییەکان دەچـوو،

سوپای هەردوو وڵات ئاگریان بەسەر یەکدا دەباراند. شەڕی ئەو شەوەی گوندەکەمان (دەرگەڵە)ش لەشەڕی ئەو دوو وڵاتە دەچوو، لە هەموو قۆڵەکان، لەسەر کێوە بەرزەکان و لە نێو رەزی تری و باخی بادەم و سماقەکانەوە بەدەم تەقەکردن بەئاراستەی نێو گوند هاتنە خوارێ و تەنها فریای ئەوە کەوتم جلوبەرگەکانم بکەمە بەر و زۆر بەپەلە لەنێو گوند دەرچووم، لەگەڵ چەند هاورێیەکم بەرەو شاخی کارۆخ رۆیشتین. لە نیوەی رێگە بوین بڵێسەی ئاگرم بینی لە خانوەکەی ئێمە هەڵسا و سوتاندیان، ئەو خانوەی چەند مانگێك بەر لە سوتاندنی بەدەردەسەرییێکی زۆر دروستمان کردبوو و هێشتا بەتەواوی پشوومان تێدا نەدابوو، هەر لەکاتی سوتاندنیەوە بۆمن بوو بە خەمێکی گەورە، تۆبڵێی چارەنووسی دایکم و خوشك و برا بچوکەکەم چی بێت؟ ئەو رۆژە زۆر سەخت بوو، تا رۆژی دواتر هەواڵی دایکم و خوشك و براکەمم پێگەیشت، کە سەلامەتن و خزمەکانمان پاراستویانن ئارامم لێ هەڵگیرابوو. ئیتر لەو رۆژەوە ئێمە بێ ماڵ و حاڵ بووین و ژیانی ئاوارەیی بە فۆرمێکی تر دەستی پێکردەوە.

من بە تەمەن بچووك بووم، بەڵام لە نێوجەرگەی شەڕی ناوخۆدا بووم، ناوچەکەی ئێمە هەر لەسەرەتای هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆوە هیچ کاتێك بێ تەقوتۆق نەبوو، بەردەوام لە شاخ و گرد و بەرزاییەکانیدا شەڕ هەبوو، ئەوەش هۆکارێك بوو، کە بێ هیوابم لە چاك بوونی بارودۆخەکە، پێموابوو ئیتر کوردستان

دوو بەرەی شەڕی نەبڕاوە دەبێت و ئاستەمە جارێکی تر ئەو دوو بەرەیە بەیەکەوە هەڵبکەن و بسازێن.

وەك تێکڕای ئەو گەنجانەی نیشتمانیان جێهێشت، منیش لە سەرەتای تەمەنی لاویەتیدا بڕیاری سەفەرمدا، بڕیارمدا ئیتر سەری خۆم هەڵگرم و ئەو وڵاتە بۆ شەڕکەر و بێباکەکان جێبێڵم. بڕیارمدا بڕۆم، چونکە بە بیرکردنەوەی خۆم ئەو شەڕە هێندەی تر و رەنگە تا ئەبەدیش درێژە بکێشێت و براکان تێر نەبن لە رشتنی خوێنی یەکتری، بڕیارمدا سەرکێشییەك بە ژیانی خۆم بکەم. بیرم دەکردەوە ژیانی رۆژانەمان لەم وڵاتی ئاگر و ئاسنەدا هەموو رۆژێك سەرکێشییە، با جارێك سەرکێشییەکی تر بکەم و رزگارم بێت لەو ئاگر و ئاسن و کوشتن و بڕینە. بیرم لەوە دەکردەوە بەدوای ژیاندا بگەڕێم و کۆڵنەدەم تا دەگەمە شوێنێك، کە هەست بکەم وەك مرۆڤ دەژیم، بۆیە ناوەڕاستی مانگی ئایاری-١٩٩٧ م هەڵبژارد، بۆئەوەی سەفەر بکەم بەرەو ئەوروپا.

دەمەو ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی ئایاری ١٩٩٧ چاوم بە قاچاغچییەك کەوت، دوای چەند دانیشتنێك لەگەڵی رێککەوتم. دوای رێککەوتنەکە جارێکی تر بینیمەوە، ئێمە رێککەوتبووین کە بە بڕی ١٥٠٠ دۆلاری ئەمریکی بمگەیەنێتە ئەسینای پایتەختی یۆنان، ئەو دیدارەمان لە یەکێك لە چایخانەکانی شاری رانیە بوو، کەسێکی ناردبوو بەشوێنمدا و پێی وتم، کە ئەو لە چایخانەکەی بەرامبەر بازاڕی دۆلارەکە چاوەڕوانت دەکات، کە چووم ئەوم بینی

لە سوچێکی پشتەوەی چایخانەکە دانیشتبوو، هەستم کرد خۆی شاردۆتەوە، زۆر رووی نەدەکردە دەرەوە و پێدەچوو رازی نەبێت کەس بیبینێ نەبادا ئاسایش دەستگیری بکات، چونکە ئەوکاتە قاچاغچییەکان دەستگیر دەکران و دەخرانە زیندان یان بە بڕێکی زۆر سزای ماددی ئازاد دەکران و بەڵێننامەیان لێ وەردەگیرا، کە واز لە کاری قاچاغچێتی بێنن، دەسەڵات هەوڵیدەدا بەم شێوازە رێ لە کۆچی بەکۆمەڵی گەنجانی وڵاتەکەیان بگرن، ئەو لە چایخانەکە بە دەنگێکی نزم داوایکرد لێی نزیکبمەوە، چومە لای و چەند قسەیەکی بۆ کردم، ئەو وتی خۆت دەزانی ١٨ی مانگ دەکەوینە رێ، دەبێ بە باشی خۆت ئامادە بکەیت، کاڵەی باش و جانتای قایم و هەندێك پێداویستی خواردن و جلوبەرگی زیادە لەگەڵ خۆت بێنە، کات و ساتی سەفەرەکە لای هیچ کەسێك باس مەکە و با کەس نەزانێت کەی سەفەر دەکەیت، ئەوانە ئەو کۆمەڵە قسەیە بوون، کە قاچاغچییەکە بەدوای یەکدا کردنی، دواتر جانتا لە پێست دروستکراوەکەی کردەوە، دەفتەرێکی قەبارە گەورەی دەرهێنا، دەستی کرد بە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییانەی لە لاپەڕەکەدابوون، ناوە ناوە پرسیاری ناو و زانیاری کەسێتی لێدەکردم، تا گەیشتە ئەوەی دەفتەرەکەی خستە بەردەستم و گوتی ئەو گرێبەستە ئیمزا بکە، منیش خوێندمەوە تێکڕای خاڵەکانی گرێبەستەکە پێکهاتبوون لە پاراستنی مافەکانی قاچاغچییەکە، بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشام لەبەشی سەرەوەی لاپەڕەکە، بە خەتێکی خۆشی

هونـەری نووسـرابوو (کل نفـس ذائقـة المـوت) بەخێرایـی کەوتمـە بیرکردنـەوە لـەو ئایەتـە، تـۆ بڵێـی لـەو سـەفەرەدا مـەرگ یەخـەم پێنەگرێ؟ ئـەم ئایەتـە بـۆ خراوەتـە سـەر گرێبەستەکە؟ ئەگـەر لـەو رێ و بانانـە شـتێکمان لێهات خـۆ بەپێـی گرێبەسـتەکەش بێت نابـێ تەنانـەت پرسـیارێکیش لەقاچاغچییەکـە بکرێـت، ئـەی بـۆ رازی بـم و ئیمـزای گرێبەسـتەکە بکـەم؟ لـەو بیرکردنەوانەدا بـووم قاچاغچییەکە بیرکردنەوەکانــی پچڕانــدم و بــە پێکەنینــەوە وتــی: چیــە ترسـای لـەو ئایەتـە؟ بیـری لـێ مەکـەرەوە و مەترسـە، ئـەوە گرێبەسـتەکەم دابـوو بـە هاوڕێیـەك بـۆم چـاپ بـکات نازانـم بـۆ ئەمـەی بـۆ زیـاد کـردووە! دوای ئـەو قسانەی قاچاغچییەکە گرێبەسـتەکەم ئیمـزا کـرد و پێشـتریش داوای چەنـد وێنەیەکـی مامەڵەی لێکردبـووم، وێنەکانـم دایـە دەسـت بـۆ ئـەوەی پاسـپۆرتی سـاختەم بـۆ دروسـت بـکات، دوای چـا خواردنەوەیـەك ماڵئاواییمـان لـە یەکتـر کـرد.

ئـەو چەنـد رۆژەی لەبەردەممـدا بـوو رۆژانـی سـەخت بـوون، دڵـە راوکێیەکـی زۆر زۆرم هەبـوو، بیـرم لـە هەمـوو شـتێك دەکـردەوە، لـە تەنیایـی دایکـم و باوکـم، چونکـە بـە رۆیشـتنی مـن جگـە لـە بـاڵای بـرام و بەهـرەی خوشـکم، کـە لـە مـن بچووکتربـوون، کەسـی تریـان لا نەدەمایـەوە، ئەوکاتـە دارای بـرا گـەورەم و شـنەی خوشـکم، کـە لەمـن بچوکتـر بـوو هەردووکیـان سـاڵێك زیاتـر بـوو، بوبونـە گەریـلا و هیـچ هەواڵێکیشـان نەبـوو، هەمیشـە بیـرم لـە ئـازاری دووری خوشـك و براکـەم دەکـردەوە، کـە دایکـم ئازارەکـەی دەچەشـت

و دەمزانی بە دوور کەوتنەوەی منیش ئازارەکە سەختتر دەبێت بۆی، لەگەڵ ئەوەشدا بیرم لە بارودۆخی سیاسی و ئەمنی و لە سەروی هەمووشیانەوە ئابووری دەکردەوە و پێموابوو بە گەیشتنم بۆ یەکێك لە وڵاتە ئەوروپییەکان دەتوانم ژیانی دایکم و باوکم و خوشك و براکەم بگۆڕم و لە نەهامەتی ئاوارەیی رزگاریان بکەم، هەر ئەوکاتە باپیرم (جەلال بەگی دەرگەڵە) نەخۆشبوو و لە نەخۆشخانە خەوێنرابوو، زۆرجار سەردانم دەکرد و شەوانیش بەدیارییەوە دەمامەوە، سێ شەوی کۆتایی نەمتوانی لەلای بمێنمەوە، چونکە سەرقاڵی خۆئامادەکردن بووم بۆ سەفەرەکەم، بەڵام رۆژانە دەچوم سەردانم دەکرد، پێشتر ئاگادارم کردبوۆوە، کە بەنیازی ئەو سەفەرەم، بەڵام ئەو هیچکات رەزامەندی نیشان نەدا بۆ سەفەرەکەم، باپیرم پیاوێکی خوێندەوار و زمانزان و بەئاگا بوو لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەش، دەیزانی رێگەی قاچاغ سەرکێشییە، ئەو پێیوابوو کاتی سەفەر نییە و بارودۆخەکە سەختە، لەبیرمە دوا قسەی ئەوەبوو، وتی هیوادارم بە سەلامەتی دەربچیت و بگەیتە شوێنی خۆت، بەڵام زۆر ئاگاداربە لە تورکیا بگیرێیت و رادەستی کوردستانت بکەنەوە، دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچە سنورییە، مەبەستی(پارتی دیموکراتی کوردستان) بوو، بەزەییان پێتدا نایەتەوە و دەتکوژن، بۆیە زۆر ئاگاداری خۆت بە و بە هەستیاری مامەڵە بکە.

رۆژی پێش سەفەرەکەم قاچاغچییەکە ئاگاداری کردمەوە، کە رۆژی دواتر کاتژمێر پێنجی ئێوارە دێت بەدوامدا و دەکەوینە رێ· ئەوشەوە تا بەرەبەیان نەمتوانی بخەوم، هەستم بە دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکرد، کە رۆژ بۆوە زۆر بێتاقەت و ماندوو بووم، نەمتوانی نانی بەیانی بخۆم، دایکم بە قورگێکی پڕ لە گریان وتی نیوەڕۆ (کفتە) ئامادە دەکەم، خوا دەزانێ کەی دەتوانی جارێکی تر کفتە بخۆی، تۆ زۆر حەزت لە کفتەیە· نیوەڕۆ هەموومان لەسەر سفرە کۆبوینەوە، بەڵام من بە هەزار حاڵ توانیم پارچەیەك کفتە بخۆم، هەستێکی زۆر ناخۆشم هەبوو، نەمدەزانی بۆچی وام، ناوە ناوەش دڵی خۆم دەدایەوە و بەبەرخۆمەوە دەمگوت ئەو هەزاران گەنجەی سەفەریانکردووە و بە نیازن سەفەر بکەن بڕوا ناکەم کەس وەك منی کردبێت و ئاوا خۆی بێتاقەت کردبێ، خۆ ئەوانیش کەسوکاریان هەیە و بەجێیان هێشتوون یان بەجێیان دێڵن· دوای نیوەڕۆ، وردە وردە لە کاتی سەفەرەکە نزیك دەبوومەوە، ئەو چەند کاتژمێرە زۆر بە خێرایی تێپەڕین، هەستم بە ئازاری هەموو جەستەم دەکرد، حەزم دەکرد یەکێك هەست بە ئازارەکانم بکات و پێم بڵێ بەو ئازارەوە سەفەر مەکە، بەڵام باوکم و دایکم و کەسوکاریشم لەسەر بڕیارەکەی من بڕوایان هاتبوو، بۆیە کەس هەستی بە ئازارەکەم نەکرد·

لەکاتی دیاریکراودا ئۆتۆمبێلی قاچاغچییەکە بە پڕ لە نەفەرەوە لەبەر دەرگا وەستا و داوایان لێکردم، کە زۆر بەخێرایی ماڵئاوایی

لـە کەسـوکارەکەم بکـەم. ئیتـر مـن فرمێسـکەکانی دایکمـم بینـی، هەسـتم بـە قورگـی پـڕ گریانـی باوکـم کـرد، قوڵپـی گریانـی خوشـك و بـرا بچوکەکـەم بینـی ئیتـر ئەژنـۆم شـکا و بڕسـتم لـێ بـڕا، خـۆم خزانـدە باوەشـی دایکـم، ئـەو تێـر بۆنـی پێوەکـردم و باوکیشـم دەسـتی خستە سـەر شـانم و خوشـك و براکانیشـم ئەمـلاو ئەولایـان گرتبـووم، حـەزم نەدەکـرد لـە باوەشـیان بێمـەدەر، چەنـد خولەکێـك وا بـووم، تـا دەنگـی قاچاغچییەکـە بـەرز بـۆوە و وتـی کاکـە خێراکـە تـا هەمووومـان نەگیراویـن، ئیتـر باوەشـی ئەوانـم جێهێشـت و لـە ئۆتۆمبێلەکـە سـەرکەوتم، حـەزم دەکـرد تـا ئـاوا دەبـم سـەیریان بکـەم، بـەڵام فرمێسـکی چـاوم مـەودای بینینـی هێنـدە کـەم کردبوومـەوە چەنـد مەترێـك ڕۆیشـتین ئیتـر ئەوانـم لـێ دیـار نەمـا. لـە ڕانیـەوە بـەرەو قـەڵادزێ کەوتینـە ڕێ، دیـار بـوو هاوئاهەنگـی لەگـەڵ بازگـەکان کرابـوو، لـە بازگـەی دەربەنـدی ڕانیـە پاسـەوانەکە بـە پێکەنینـەوە پێـی وتیـن دەچنـە ئەورووپـا بـەڵام، کـە گەڕانـەوە بـا سـیمای کوردانەتـان بمێنـێ، کـە بەسـەفەریش هاتنـەوە خۆتـان لەسـەر خەڵـك هەڵمەکێشـن و سـەفەرتان خێـر و بـە سـەلامەت. لـەوە تێگەیشـتم قاچاغچییەکـە ڕێککەوتنێکـی هەبـوو لەگەڵیـان. گەیشـتینە نـاو شـاری قـەڵادزێ و لەنـاو جەرگـەی بـازاڕ وەسـتاین و کەسـێك لەمـاڵ هاتـەدەر و لـە ئۆتۆمبێلەکەمـان سـەرکەوت و کەوتینـە ڕێ، باپیـرم ئـەوکات لـە نەخۆشـخانەی قـەڵادزێ خەوێندرابـوو، کـە نزیکـی نەخۆشـخانەی قـەڵادزێ بوینـەوە بـە قاچاغچییەکـەم وت

تەنها دە خولەك لەسەرم بوەستن باماڵئاوایی لە باپیرم بکەم، ئیتر بە زەحمەت توانیم رازی بکەم و بە نابەدڵی بە شۆفێرەکەی وت بوەستە و بەپەلە خۆم گەیاندە لای باپیرم، زۆر دڵتەنگ بووم لەوێ هەستم بەوەکرد کە ئەمە دوواجارە دەیبینم، چەند خولەکێك لای بووم دیسانەوە ئامۆژگاری کردم، کە زۆر ئاگاداری خۆم بم و منیش بە سەر لەقاندن و قورگێکی پڕ لە گریان رەزامەندیم نیشان دەدا، ئیتر دوا ماڵئاواییشم لە باپیرم کرد و جارێکی تر کەوتینەوە رێ بەرەو سنوری ئێران و شارەدێی هەڵشۆ. درەنگانی شەو لە شارەدێی هەڵشۆوە بەرە و شاخی بەردەسپیان کەوتینە رێ، ئەو شەوە شەوێکی پڕ هیلاکی بوو، زیاتر لە سێ کاتژمێر بێ وەستان رۆیشتین تا گەیشتینە لوتکەی بەردە سپیان. چەند مانگێك پێشتر، لەکاتی شەڕدا بەهەمان رێگەدا رۆیشتبووم، هەرچەندە شەوگارێکی تاریك بوو، بەڵام شوێنەکانم دەناسیەوە، بەر لەوەی بگەینە سەر شاخ کانیاوێکی سازگاری لێبوو، پێشتر لەو کانیاوە ئاوم خواردبۆوە، کەسمان ئاوی خواردنەوەمان پێنەبوو، من پێمگوتن، کە کانیاوێك لەسەر رێگەمانە، لەسەر کانیاوەکە پشوێکماندا و تێر ئاومان خواردەوە و کەوتینەوە رێ بەرەو گوندی بێورانی رۆژهەڵاتی کوردستان. ئەو شەوە لەو گوندە لە ماڵێکی کوردەواری پشوماندا و خزمەتێکی زۆر باشیان کردین، بەڵام هێندە هیلاك بووین هەریەکێکمان لەهەوڵی ئەوەدابوو شوێنێك بگرێت و بخەوێت. رۆژی دواتر تا ئێوارە لەو ماڵەماینەوە، نەماندەتوانی

هاتوچۆی دەرەوە بکەین، چونکە پایگای سەربازانی ئێرانی لەنزیک گوندەکە بوو، ئەگەر بیانزانیبا لەو ماڵەین، ماڵەکەشیان توشی گرفت دەکرد، هەرچەندە خاوەن ماڵ ترسی زیاتری لە جاش و جاسوسەکان هەبوو، زوو زوو دەیگوت ئەگەر جاش و سیخوڕەکان هەواڵمان لێنەدەن پاسدارەکان چوزانن چی دەگوزەرێ. ئەو رۆژە هەموومان پێکەوە لەو ماڵە ماینەوە، خزمەتێکی باشیان کردین و خواردنی باشیان پێداین، ئێوارەکەی دەمەو تاریکبوون دوو پیکاب هاتن و لە پشتی ئەو پیکابانە سەرخراین بەرەو شاری (ورمێ) تا بەیانی بە رێگەوە بووین. شەوێکی سەخت و پڕ بێزاری بوو، دەبوایە لەنێو ئۆتۆمبێلەکە پاڵ بکەوین و سەر بەرز نەکەینەوە، چونکە رێگاکەش قاچاغ و جادەی خۆڵ بوو، ئۆتۆمبێلەکە هێندە هەڵبەز و دابەزی دەکرد هەستمان بە تێکشکانی هەموو ئێسقانی گیانمان دەکرد، ئازار و نارەحەتییەکی ئێجگار زۆرمان بینی تا گەیشتین. بەرەبەیان لە باغێکی تەنیشت شاری ورمێ لە ئۆتۆمبێلەکان دابەزین، خۆشیی گەیشتن بەو شارە کەم وێنە بوو، خۆشییەکەی لە خۆشی ئازاد بوونی زیندان دەچوو، چونکە شەوی رابردوو هێندە سەخت بوو زۆرجار خۆزگەمان دەخواست دەستگیر بکرێین و رزگارمان بێت. قاچاغچییەکە لەگەڵ چەند کەسێکی ئەو شارە کەوتنە دابەشکردنی ئێمە بەسەر چەند ماڵێکدا، هەر شەش کەس و بردنیان بۆ ماڵێک، ئەوماڵەی ئێمە بۆی چوین لە گەڕەکی کوشتارگای شاری ورمێ بوو. بەشێکی

زۆری دانیشتوانی ئەو گەڕەکە کوردی شکاک بوون، خاوەنی ماڵەکە پیاوێکی کوردی شکاک بوو بە ناوی ئەسعەد، دەرکەوت ئەسعەد دوو هاوسەری هەیە، هاوسەری یەکەمی بە چەند ساڵێك لەخۆی گەورەتر بوو، ئەوەی دووەمیشی بیست ساڵ لەخۆی بچوکتر بوو، پێنج شەو لەو ماڵە ماینەوە، هەر زوو هەستمان بە نادادپەروەری و جیاکاری کرد، تێگەیشتین، کە لەو ماڵەدا نادادپەروەری و زوڵم و چەوسانەوە هەیە، هەر واشبوو، سەرنجمان چۆ سەر منداڵەکانی، کە لەو ماڵە دەژیان، منداڵی ژنە بچوکەکە جلوبەرگی جوان و پاك و خاوێنیان لەبەردابوو و لەنێو ماڵ دەچوون و دەهاتن و سەرقاڵی یاری منداڵانەی خۆیان بوون، منداڵی ژنە گەورەکە رووت و رەجاڵ و هیلاك دیار بوون، هەر رۆژ دەبۆوە دەچونە کۆڵان و بە سینی وردەواڵە و شیرینیان دەفرۆشت، کە ئێوارە دادەهات ئەسعەد حیسابی لەگەڵ دەکردن و پارەکەی لێوەردەگرتن. خانووەکە دوو بەشبوو، ئەو بەشەی ژنە بچوکەکەی تێدا دەژیا پاکوخاوێن و رێکتر بوو و ماڵێکی نوێ و کەلوپەلی تازەی گرانبەهای تێدا بوو، ئەو بەشەی ژنە گەورەکەشی تێدا دەژیا بە پێچەوانەوەی خانوو و کەلوپەلەکانی ناوماڵی ژنە بچوکەکە بوو و هی چەند دەیەیەك پێش ئەوکاتە بوون. ئێمە زوو گێرِامانەوە بۆ سەلیقەی جیاواز، چونکە تەمەنیان جیاوازییەکی زۆری هەبوو، بەڵام دوای چەند کاتژمێرێك ژنە گەورەکەی لە نادادپەروەری و ئیهمالی هاوسەرەکەی تێگەیاندین، ئەو ماڵە کرێی مانەوە و خواردنی

ئێمەیـان لـە قاچاغچییەکـە وەردەگـرت، ژنـە گەورەکـەی ئەسـعەد خزمەتـی ئێمـەی خرابـۆ ئەسـتۆ، ئـەو پێنـج رۆژە ئیشوکارمان نەبـوو، بۆیـە شـەنوکەوی ژیانـی ئـەو خێزانەمـان کـرد، هەریەکـە و رایەکـی هەبـوو، سـەرەنجام هەمـوومـان کـۆك بوویـن، کـە کلتـور و دیـاردەی فرەژنـی ئـەو نادادیـەی لـێ دەکەوێتـەوە، خۆمـان بـۆ نەگیـرا شـەوی چوارەم سـەرمان خستە سـەر ئەسـعەد و کۆڵێکمـان پێکـرد، راشکاوانە پێمانگـوت، کـە کاتژمێرەکانـی سـەرەتا هەسـتمان بـە جیـاکاری و نادادپـەروەری و چەوسـانەوە کـردووە، چـۆن مـرۆڤ دەتوانێـت لـە نێـوان منداڵـی دوو هاوسـەری خـۆی جیـاوازی بـکات، ئێمـە زۆر بـە مکـوڕی قسـەمان لەگـەڵ کـرد، بـەڵام هەسـتمانکرد خەریکـە گومـان دەکات، کـە ژنـە گەورەکـەی ئـەو شـتانەی پێگوتبیـن، بۆیـە شـێوازی قسەکانمان گـۆڕی و وتمـان ئێمـە سـەرنجی خۆمانـە پێـت دەڵێیـن و رەنگـە هـەردوو هاوسـەرەکەت بـەو ژیانـە رازی بـن.

شـەوی شەشـەم خۆمـان کۆکـردەوە و غەمەکانـی (هاجـەر)ی ژنـە گەورەی ئەسعەدیشمان لەکۆڵنـا و بـەرەو ناوچـەی سـەڵماس و گونـدی (سـوڵتانە) کەوتینـە رێ. دیسـانەوە بـە رێگـەی قاچـاغ و هەڵبـەز و دابەزێکـی زۆری نێـو پیکابەکانـدا رۆیشـتین، بەرەبەیـان گەیشـتینە ئـەو گونـدە، تەنها دوو کاتژمێـر کاتمـان هەبـوو بـۆ پشـوو، کـە رونـاك داهـات بـە پەلەپـەل نـاو گوندمـان جێهێشـت و بـەرەو زنجیـرە چیـای (مەیـدان) کەوتینـەڕێ، دەکەوێتـە رۆژئـاوای شـاری ورمـێ و سـەر سـنوری رۆژهـەڵات و باکـوری کوردسـتان. لەناوەڕاسـتی شـاخەکە کانـی

و ئاوێكی سازگاری لێبوو، لەنێو بەردەڵانێك ئاوێكی زۆر و سارد هەڵدەقوڵا، لەوێ لەسەر بەردە رەشەكان پشووماندا و پێمانوابوو، كە بۆ نیوەڕۆ دەگەینە سەر لوتكەی شاخەكە، قاچاغچییەكە زۆر پەلەی بوو، هەر دەیگوت دەبێ نیوەشەو قەرەقولی توركیا تێپەڕێنین، بۆیە پشووەكەمان كورت بوو، پێشبینیەكەمان راست بوو و نیوەڕۆ گەیشتینە سەر لوتكەی شاخەكە، كە هێشتا سپی بوو و بەفرێكی زۆری پێوە مابۆوە. لەوێوە لە دەشتی سەڵماس و ورمێ رامابووین، جوانییەكی كەم وێنە و دڵڕفێنی هەبوو، تا چاو بڕی دەكرد سەوزایی و باغ بوو. لە پڕ تەقەیەكی زۆر نزیك لەنێو ئێمەوە هات، دەنگی لە تەقەی تفەنگ دەچوو، هەموومان بەیەكەوە هەڵسانە سەر پێ و شڵەژاین، یەكێك لە هاوڕێیانمان گوتی نیگەران مەبن ئەوە من چەرخم بۆ ئەو هاوڕێیەی تر هەڵدا تا جگەرەی پێ داگیرسێنێ بەر بەرد كەوت و تەقیەوە، دوای ئەو قسانەی ئارام بووینەوە و پشووەكەشمان كۆتایی هات.
ئێمە پێمان وابوو، كە بەشێكی باشی رێگەكەمان بڕیوە، كاتێك قاچاغچییەكە گوتی: دەی با بڕۆین ئەو شاخەی بەردەممان ماوە و دەبێ نیوە شەو لە قەرەقول تێپەڕین. ئەو شاخەی ئەو باسی دەكرد زۆر لەوەیان بەرزتر بوو، كە لەبەرەبەیانەوە بەڕێوەبووین تا گەیشتینە سەر لوتكەكەی، بەشێكی زۆری هاوڕێكانم ئەژنۆیان شكا، چونكە فێری بەشاخدا هەڵگەڕان نەبوون و نەیاندەتوانی بە باشی رێ بكەن. كەوتینەوە رێ و قاچاغچی هەر دەیگوت پەلەبكەن،

بەتولە ڕێگەکانـدا ڕێچکەمـان بەسـتبوو، دەوروبـەری ڕێگاکـە بـە بەفـر داپۆشـرابوو، تـا زیاتـر سـەر دەکەوتیـن بارسـتایی بەفریـش ئەسـتورتر دەبـوو. لـە نیـوەی ڕێـگا شـەومان بەسـەرداهات، بـەڵام بەهـۆی بوونـی بەفرێکـی زۆر و ڕووناکـی ئاسـمان مـەودای بینیـن زۆر بـوو و بەباشـی یەکتـری و دەوروبـەری خۆشـمان دەبینـی. درەنگانێکـی شـەو دوای هیلاکییەکـی ئێجگار زۆر گەیشـتینە سـەر لوتکـەی شـاخەکە و ئیتـر سـەرەوخوار بووینـەوە بـەرەو ئـەو روناکیـەی، کـە بـە ئاسـتەم لێمـان دیـار بـوو، هاتنەخـوار لـە شـاخدا ئەگـەر دوو هێنـدەی سـەرکەوتن سـەخت نەبێـت، ئـەوا دڵنیـام وەك یەکـن. شـاخی دووەم، کـە پێیـدا سـەرکەوتین کەوتبـووە نێـو خاکـی باکـوری کوردسـتان و یـەك ناویشـیان هەیـە، کـە چەنـد شـاخێکن بەیەکـەوە بەسـتراونەوە و پێیـان دەوترێـت زنجیـرە چیـای مەیـدان. بەهـۆی سـەختی شـاخەکە و بوونـی بەفرێکـی زۆر هیـچ پاسـەوان و بارەگایەکـی سـەربازی تورکـی لێنەبـوو. نیوەشـەو تـەواو لـە ڕووناکییەکـە نزیـك بووینـەوە، لەژێـر تییـە شـاخێك خۆمـان پەنـادا تـا کاروانێکـی دوور و درێـژ هـات، کـە چەنـد نەفەرێـك بـوون و دەیـان وڵاغیـان پێبـوو و بارەکانیـان گازۆیـل بـوو، بەقسـەی قاچاغچییەکانمـان ئێمـە خۆمـان خزانـدە نێـو قافڵـەی کاروانەکـە و هـەر یەکـە و بـەدوای وڵاغێکـدا ڕۆیشـتین، دیـار بـوو ئـەو کاروانـە ڕێککەوتنـی لەگـەڵ قەرەقـول هەبـوو، قاچاغچییەکـەی ئێمـەش ئـاگاداری هاتنـی کاروانەکـە بـوو، بۆیـە لەگـەڵ کاروانچییـەکان ڕێککەوتبـوو. زۆر ئازادانــە بەبەردەمــی قەرەقولــدا ڕۆیشـتین، کـە

پاسەوانەکان چەند مەترێک لێمانەوە دوور بوون، هەرچەندە ئێمە ترسێکی زۆرمان هەبوو، چونکە پێمان وانەبوو بە ئاسانی بتوانین ئەو سنورە ببڕین، کە جەندرمەی تورکیی پاسەوانی بوون و تەنانەت بڕیاری تەقەکرنیشیان پێ بوو، کە نەهێڵن هیچ کەسێك بە نایاسایی لەوێوە دەربازی ناو خاکی باکوری کوردستان بێت، کە لەقەرەقول تێپەڕین یەکێك لە کاروانچییەکان رۆیشتە لای جەندرمەکان، کە وا پێدەچوو حەق و حیسابی لەگەڵ کردبن. ئێمە هەر نەوەستاین تا گەیشتینە یەکەم گوندی باکوری کوردستان بەناوی (دریشك) کە سەر بەقەزای (باشقەلا)ی پارێزگای (وان)ە، تا بەرەبەیان لەژێر دیواری ماڵەکان خۆمان پەنادا و سەرماش تینی بۆ هێنابووین، کە رووناك داهات کامیۆنێکیان هێنا و هەموومان سەرکەوتین و بەرەو گوندی (دەراو) کەوتینە رێ و دوای نزیك بە دوو کاتژمێر گەیشتینە ئەو گوندە و لە دوو ماڵ پشووماندا. شەوێك لەو گوندەماینەوە، دەراو گوندێکی وشك و بەردەلانە، تەنانەت پارچە زەوییەکمان نەبینی، کە بەکەڵکی کشتوکاڵ بێت، کەوتۆتە دۆڵێکی قوڵی نێوان دوو شاخی بەرز و رێگایەك بە نێویدا تێدەپەڕێ بۆ سەر سنوور. کە پێکهاتەکەمان بینی زۆر سەرنجڕاکێش بوو، ئاخر ئەو هەموو خەڵکە لەو گوندەدا بەچی دەژین، خۆ پارچەیەك زەوی کشتوکاڵی بەدی ناکەین! رەز و باخێك نابینین، ئەوە مایەی پرسیار و سەرسوڕمانی هەمووومان بوو؟! شەو لەگەڵ خاوەن ماڵ کەوتینە گفتوگۆ، من کرمانجییەکی باشم

دەزانـی لەگـەڵ نەختێـك تورکـی، کـە ئـەو کرمانجییـە و تورکییـەم لـە منداڵیـدا فێـر بووبـووم، چونکـە چەنـد ساڵێك پێشـتر و دوای ئەنفالـەکان، بەهـۆی پێشـمەرگایەتی باوکـم ماڵمـان لـە شـارۆچکەی (نەغـەدە)ی رۆژهەڵاتـی کوردسـتان بـوو، ئـەو شـارۆچکەیە خەڵکێکـی زۆری شـکاك و ئـازەری تـورك زمانـی لـێ دەژیـان و بەهـۆی تێکەڵاویـم لەگەڵیـان بەتایبەتـی لـە خوێندنگـە تـا ئەندازەیەکـی بـاش فێـری زاراوەی کرمانجـی و زمانـی تورکـی بوبـوم. بۆیـە گفتوگـۆی خـاوەن مـاڵ لەگـەڵ منـدا گەرمتـر بـوو، ئـەو پرسـیارەم ئاراسـتە کـرد، کـە لای هەمومـان دروسـت بـووە، لەوەڵامـدا وتـی پرسـیارەکەتان زۆر راسـتە، بـەڵام ژیانـی ئـەو هەمـوو خەڵکـە لەسـەر ئـەو مەرزەیـە، کـە ئێـوە بـە قاچـاغ پێیـدا هاتـن، گوتـی بـە درێژایـی مێـژوو ئـەو مـەرزە نایاسـاییە بازرگانـی قاچاغـی تێـدا دەکرێـت، لەودیـوی شـاخەکانەوە چەندیـن رێـگای سـەخت هەیـە بـۆ ئـەوەی بگەینـە سـنوری ئێـران، هەمـوو رێـگاکان بـەکار دەهێنیـن. زوو زووش دەیگـوت ژیـان سـەختە و ئاسـان نییـە زۆرمـان لـێ کـوژراوە بـە دەسـترێژی پاسـداری ئێرانـی و جەندرمـەی تورکـی و لوغـم و هەڵدێـران، خەڵکێکـی زۆریشـمان کەمئەنـدام بـوون و بەشێکیشـمان لێـرە و لـە ئێـران زیندانـی کـراون. ئێمـە لـەوە تێگەیشـتین، ئەگـەر ئێـران و تورکیـا ئـەو سـنورە توندتـر بکـەن و رێگـە نـەدەن کاری قاچاغـی تێـدا بکرێـت خەڵکێکـی زۆری ئـەو سـنورە بێـکار دەبـن و دەبـێ ماڵەکانیـان جێبێڵـن و بـەرەو شـار کـۆچ بکـەن. شـەوی دواتـر بـەرەو قەزای(باشـقەڵا) و پارێـزگای (وان) بە

سێ دۆڵمووش (مینی پاس) کەوتینە رێ. رێگاکە تا بڵێی سەخت و تاریك و سامناك بوو، ئۆتۆمبێلەکان چراکانیان کوژاندبۆوە، ئێمە هەموومان لە دڵە راوکێیەکی ناخۆشدا بووین. گەیشتینە شوێنێك شوفێرەکە گوتی بەر لەچەند مانگێك وەجبەیەکی قاچاغی وەك ئێوە لێرەدا کەوتنە بۆسەی کۆماندۆکانی تورکیا و هەموویان گوللەبارانکردن، قسەکەی تەواو کرد و چەند خولەکێك دواتر کەوتینە بۆسەیەکی چەکداران، لە هەموو لایەك گوێمان لە هێنانەوەی میلی چەکەکان بوو، شڵەژانێکی تەواو دروست بوو و کەس نەیدەزانی چی روو دەدات؟! هەمووممانیان لە ئۆتۆمبێل دابەزاند. داوایان لە شوفێرەکان کرد چرای ئۆتۆمبێلەکان داگیرسێنن، تا ئەوکاتە دیمەنی ئەو چەکدارانەمان نەبینیبوو، بەڵام هەمووممان تۆقین و کەس بڕوای وانەبوو گیانمان بە سەلامەتی دەرباز دەبێت، چونکە وەك شوفێرەکە وتی چەند مانگێك لەوەوپێش لەو ناوچەیە پەنجاویەك کۆچبەر کەوتنە بۆسەی چەکدارەکان و هەموویان گوللە باران کران، کە بەشێکیشیان ژن و منداڵ بوون، پێشتریش ئەو چیرۆکە دڵتەزێنەمان زانیبوو، ئێمەش هەمووممان خەیاڵمان لای ئەو رووداوەی ئەوسابوو، دەمانگوت ئەوەی بەسەر ئەوان هات بەسەر ئێمەش دێت و دوایین خولەکەکانی ژیانمانە. دوای چەند ساتێك تێگەیشتین، کە ئەوانە کۆماندۆ و جەندرمە نین بەڵکو (کوروجی) ین، واتا جاشی تورکیان، سەرجەمیان کورد بوون و جلوبەرگی کوردییان لەبەر بوو، سمێڵ و ورگ زل بوون،

روخسارێکی درندانە و قێزەونیان هەبوو، تا بڵێی ڕەش و چڵکن بوون و هیچ کات خەڵکی لەو شێوەیەم نەبینی بوو. کە دەیانگوت ئێمە کوردین بەلامانەوە سەیر بوو، چونکە لە هەر میللەتێکی تر دەچوون تەنها لەکورد نەبێ، دەرکەوت ئەوان بۆ پارە و ڕاو و ڕووت و دەسکەوت دانیشتوون. بۆیە هەر زوو لەگەڵ شوفێر و قاچاغچییەکە کەوتنە گفتوگۆ و مامەڵەی پارە، وادیار بوو داوای پارەیان دەکرد، سەرەتا پارەیەکی ئێجگار زۆریان داوا دەکرد، بەڵام قاچاغچییەکە ئەوەندە شارەزایان بوو، کە توانی بە پارەیەکی کەم لەگەڵیان ڕێککەوێت، بەو مەرجەی جگە لە ئازادکردنمان پاسەوانیشمان بکەن و بەسەلامەتی بمانگەیەننە نزیك شاری وان و هەر ئەوەش رویدا و بە ئۆتۆمبێلێکی خۆیان پێشمان کەوتن، بە ئازادی و بەسەر شەقامی سەرەکی و بەنێو شارۆچکەی (باشقەڵا) دا بەرەبەیانی زوو ئێمەیان گەیاندە نێو شاری (وان). شاری (وان) شارێکە مرۆڤ لە سەیرکردنی تێر نابێت، زۆر دڵگیر و جوان بوو، ئەوێ بەهۆی هەڵکەوتەکەی ناوچەیەکی زۆر ساردبوو، وادیار بوو تازە سەرەتای وەرزی بەهارە، تازە دار و درەخت چرۆی دەکرد و شار ڕەنگی سەوزی دەپۆشی. سروشتی ئەو شارە وایە زۆر دڵڕفێن و ئارامبەخشە، لەدەرەوەی شاردا سەیری ماڵەکانمان دەکرد، دیواری حەوشەیان نەبوو، بەڵام زۆربەی ماڵەکان پەرژینی داریان هەبوو، لەجیاتی دیوار، دار و درەختیان ڕواندوە و کردویانە بە پەرژینێکی چڕ و بەرز و جوان بۆ ماڵەکانیان. شێوازی خانوبەرە و

کلتووری شارسازی و بیناسازی زۆر جیاوازە لەگەڵ لای خۆمان. ئەو شارە زستانەکانی زۆر سەخت و دوور و درێژن و بەفرێکی زۆری لێدەبارێت، لەبەر ئەو هۆیە خانووەکانیان تەواو جیاوازن و ڕەچاوی سەرما و بەفریان کردووە لە دروستکردندا. بەڵام ئەوەی زیاتر لە هەر شتێك سەرنجی ڕاکێشاین ئەو شارەش هەر لە سەربازگەیەکی گەورە دەچوو، لەهەموو سوچ و کەلەبەرێکدا سەربازگە و زرێپۆشی سەربازیی لێبوو، هەر زوو تێگەیشتین ئەو بارودۆخە سەربازییە لەبەر ئەوەیە، کە ئەو شارە کوردستانە. بۆ ڕێگریکردن لە جموجۆڵی گەریلاکانی پەکەکە و ڕێکخستنەکانیان بەتەواوی گەمارۆی سەربازییان خستۆتە سەر ئەو شارە و دانیشتوانەکەی کە لەو کاتەدا (٧٧٢٠٠٠) کەس دەبوو و خەڵکەکەشی هەر وایان دەوت. لەوێش بەسەر چەند ماڵێکدا دابەشکراین، ئێمە کەوتینە ماڵێك، کە کوڕێکی گەنج خاوەنی ماڵەکە بوو هاوسەرێك و منداڵێکی هەبوو، زۆر خزمەتکراین و دوو شەو ماینەوە و پشوێکی باشماندا، کە لەدوای دەرچوونمان لە شاری (ورمێ) یەکەم جار بوو خواردنێکی ئاوا باشمان دەست بکەوێ. دوای دوو شەو مانەوە لە شاری (وان) و پشوێکی زۆر باش، سەرلەبەیانییەکی زوو قاچاغچییەکە هات و وتی بلیتی ئوتوبووسم کڕیوە و بەرەو ئیستانبوڵ دەکەوینە ڕێ. بەنێو کوچە و کۆڵانە ڕازاوە و دڵگیرەکانی شاردا بەرەو گەراجی گەورەی شاری وان ڕۆیشتین، لەو بەینەدا قاچاغچییەکە سەر و پاسپۆرتێکی پێداین، پاسپۆرتەکان ساختە بوون و خۆی

دەستکاری کردبوون. لە بنەڕەتدا هی خەڵکی تر بوون و وێنەی ئێمەیان خرابۆسەر، لەگەڵ ئەوەشدا ڤیزای ساختەشی لێدرابوو، پاسپۆرتەکەی من بە ناوی کەسێکی عەرەبەوە بوو، بەڵام ناوێکی سەیر و ترسناك و وێنەکەشی هی خۆم بوو، پاسپۆرتەکە لە بنەڕەتدا بەناوی (صدام حسين خلف) بوو، کە بینیم هەم پێکەنین گرتمی هەمیش ترسام، ئاخر چۆن دەتوانم بەو پاسپۆرتە رزگارم بێت؟ قاچاغچییەکە زانی دڵە راوکێم هەیە لەسەر پاسپۆرتەکە، بۆیە وتی ترست نەبێ رێگا مەترسیدارەکەمان بڕیوە و ئەوەی ماوە ئاسانە، قسەکەی ئەو راستبوو، چونکە زۆر بە ئاسایی سواری ئوتوبووسی نێوان وان و ئیستانبوڵ بووین. لە رێگا تەنها لە یەك شوێن لە نزیك شارۆچکەی (بەدلیس) لە بازگەیەك راگیراین، جەندرمەیەك هاتە ناو پاسەکە و بە روخسارێکی گرژ و تووڕە هاواریکرد و وتی هەمووتان پێناسەکانتان دەربێنن، کە گەیشتە لای من پاسپۆرتەکەی وەرگرت و لێی ورد بۆوە دواتر سەیرێکی وردی روخساری منی کرد، پاسپۆرتەکەی هەڵگێڕ و وەرگێر کرد و دایخستەوە و بەزەردە خەنەیەکەوە وتی (صدام ئابێ خۆش گالدی) واتا کاك صدام بەخێر بێیت. کێشە بۆ کەسمان دروست نەبوو و کەوتینە رێ و چوینە نێو شاری بەدلیس، ئەو شارە تابڵێی جوانییێکی سەرنجڕاکێشی هەیە، بەدلیس یەکێکە لە شارە دێرین و مێژووییەکانی باکوری کوردستان، کەوتۆتە نێوان چەند شاخێکەوە، هەندێك لە ماڵەکان بەقەد پاڵی شاخەکەوەن و کەوتونەتە سەر

یەکتــری، زۆر دیمەنێکــی جوانــی هەیــە، مــرۆڤ لــە بینینــی بێــزار نابێــت، بــەڵام ئێمــە بــۆ گەشــت و بینیــن نەچووبوویــن، بۆیــە بــە ماوەیەکی کــەم بەنێــو ئەوشــارەدا تێپەڕیــن و جێمانهێشــت. بەدلیــس دانیشــتوانێکی زۆری هەیــە ئــەو ســەردەمە نزیــك بــە (٣٠٠٠٠) کــەس لــەو شــارەدا دەژیــان، ئیتــر لەوێــوە بەنێــو دیمەنــە جوانەکانــی باکــوری کوردســتان بــەرەو شــاری (ئامــەد) دەچوویــن، شــاری ئامــەد یەکێکــە لــە گەورەتریــن شــارەکانی باکــوری کوردســتان و ئــەو ســەردەمە نزیــك بــە (١٣٠٠٠٠) کەســی تێــدا دەژیــا. لــە ڕێگــەدا بیــرم لــەوە دەکــردەوە، کــە ئێمــە وڵاتەکەمــان چەنــدە گــەورە و چەنــدەش سروشــتی جیــاواز لــە یەکتریشــمان هەیــە، ســەرنجم دەدایــە ڕێگاکــە، لــە باشــور سروشــتێکی جیــاواز لــە ڕۆژهەڵاتمــان هەیــە و لــە باکوریــش سروشــتێکی جیــاواز لــە باشــور و ڕۆژهــەڵات، هەمــوو جــۆر خاکێکمــان هەیــە بــەڵام خۆمــان خاوەنــی ئــەو وڵاتــە گەورەیــە نیــن و ئەوەتــا هەوڵــی زۆر دەدەیــن و خەرجییەکــی زۆر دەکەیــن و بــە نێــو ئــەو هەمــوو مەترسیەشــدا دەڕۆیــن تەنهــا بــۆ ئــەوەی لێــی دوورکەوینــەوە. ئێوارەیەکــی درەنــگ گەیشــتینە شــاری (ئامــەد)، لەگەراجــی ئــەو شــارە پشــوێکماندا، بــەڵام نەمانتوانــی بچینــە دەرەوە تــا تــەواوی شــارەکە ببینیــن، کــە زۆر تامــەزرۆی بینینــی بــووم، دوای کەمێــك لــە وەســتانی، پاســەکە جارێکی تــر کەوتــەوە ڕێ بــەرەو (ئەنــکارا)ی پایتەخــت، بەرەبەیــان گەیشــتینە ئەنــکارا، لەوێــش بەهەمــان شــێوە زۆر نەماینــەوە و کەوتینــەوە ڕێ بــەرەو ئیســتانبۆڵ. ئــەو ڕێگایــە دوور و درێــژ و بێزارکــەر بــوو و دوای

بیست و هەشت کاتژمێر گەیشتینە شاری ئیستانبۆڵ، تا گەیشتمە ئەو شارە سەختی زۆرم بینی، بەڵام دڵخۆش بووین کە قۆناغی یەکەمی رێگا سەخت و مەترسیدارەکەمان بە سەرکەوتوویی بڕیوە. لەگەڵ ئەو هەموو سەختیانەش لەسەر بیر و باوەڕی خۆم بەردەوام بووم و پێداگر بووم لەسەر گەیشتنم بە نیشتمانێك، کە تیایدا لانی کەم ژیانم پارێزراو بێت و وەك مرۆڤێك مامەڵەم لەگەڵدا بکرێت و دوای خەون و ئاواتەکانم بکەوم.
منی گەنجێکی بیست ساڵان تامەزرۆی بینینی بوکی ئەوروپا بووم، ئاخر ئەوکاتە ئیستانبۆڵ بەوە بەناوبانگ بوو، کەناڵە تەلەفزیۆنیەکانی تورکیاش ئەو شارەیان وا وێنا دەکرد، زۆرێك لە گەنجانی وڵاتەکەم تامەزرۆی ئەوە بوون، کە جارێك ئەو شارە ببینن و چەند وێنەیەك لە شوێنە بەناوبانگەکان بگرن و بینێرنەوە بۆ هاوڕێ و کەسوکاریان. بە گەیشتنم بۆ ئەوشارە توشی شۆك و تاساك بووم، ئاخر من لە مەملەکەتێکەوە هاتومەتە شارێك هیچ شتێکیان لەیەك ناچێ. چوار دەوری ئەو شارە دەریایە، ناو شار تەلاری بەرز و پردی سەرنجڕاکێش و شۆستە و شەقامی جوان و دڵگیری هەبوو، لە کەنار دەریاکانی ناوشاردا باخ و سەوزاییەکی زۆر رازاوە دەبینرا، خەڵکێکی زۆر لە کەنار دەریاکان کاتەکانیان بەسەر دەبرد و بەشێکیشیان سەرقاڵی راوە ماسی بوون.
ئەوەی بیرم لێ دەکردەوە بەراوردکردن بوو لە نێوان ئیستانبۆڵ و کوردستان، کوردستانی ئێمە لەو سەردەمەدا جگە لەچەك

هیــچ شــتێکی سەرنجڕاکێشــی تێدانەبــوو، دەرهاویشــتەی شــەڕەکان باسوخواســی نێــو کۆمەڵــگای ئێمەبــوو. ئێمــە غەمــی ڕزگارکردنــی ژیانــی خۆمــان بــوو لــە شــەڕی بــراکان، هەمــوو هەوڵێکمــان دەدا خۆمــان لــە وڵاتەکەمــان ڕزگار بکەیــن، چونکــە کــەش و هەوایەکیــان هێنابــووە ئــاراوە، جگــە لەبازرگانانــی شــەڕ و مــەرگ، هەمــووی لێــی بێــزار بــوون. لــە ئیســتانبۆڵیش وەك تێکــڕای دونیــا، خەڵك گلەیــی لــە سەختــی ژیــان هەبــوو، بــەڵام ئــەوان نــە لــە نێوجەرگــەی شــەڕدابوون نــە ئــازاری شــەڕی براکوژیــش وێرانــی کردبــوون، بەڕاســتی ئێمــە و ئــەوان زۆر لێــك جیــاواز بوویــن، بۆیــە هەرچەنــد لــەو شــارەم دەڕوانــی جێــی بــاوەڕ نەبــوو و هەمیشــە لەخۆمــم دەپرســی تــۆ بڵێــی وڵاتێــك هەبێــت چــەك تێیــدا قســە نــەکات؟ تــۆ بڵێــی میللەتێــك هەبێــت ئــاوا ژیــان بگوزەرێنــن؟ لــە ئەندێشــەی ئێمــەی مرۆڤــی ناوجەرگــەی شــەڕ وایــە، کــە دەبــێ لــە هەمــوو شــوێنێکی دونیــا چــەك قســە بــکات، پێویســتە حوکمــی ســەربازی بێــت، ئێمــە وامــان بیــر دەکــردەوە لــە ســەری هەمــوو شــەقامێکی ئیســتانبۆڵ ســەربازگەیەك هەبێــت و لەنێــو هەمــوو کوچــە و کۆڵانــەکان چەکــدارەکان بجوڵێنــەوە، خــۆ هــەر دوێنــێ هەمــان بارودۆخــی ســەربازیمانم بەدیکــرد لــە شــاری وان، چونکــە ئــەو شــارە کوردســتانە ئــاوا کردوویانــە بــە ســەربازگە ئــەی بــۆ ئیســتانبۆڵ وانیــە! کەوایــە ناهەقمــان نییــە چــەك لــە ئەندێشــەی ئێمــەدا پێگەیەکــی هەمیشــەیی هەیــە. هەرچەنــد بیــرم لــەو شــارە دەکــردەوە لێــی تێنەدەگەیشــتم، چــۆن دەبێــت شــارێکی وا گــەورە، کــە

نزیک بە دە ملیۆن کەس تیایدا دەژین بەبێ زەبروزەنگی سەربازی بەڕێوەبچێت!؟.

ئێوارەیەکی درەنگ بوو لە گەڕەکی (کادی کۆی) دابەزین و چوینە کەنار دەریا و وێستگەی ئەو کەشتیانەی لە نێوان ئاسیا و ئەوروپا نەفەریان دەگواستەوە، بە دوو وەجبە سواری دوو کەشتی جیاواز بووین، دوای نیو کاتژمێر لە گەڕەکی (ئەمینونو)ی بەشی ئەوروپای ئیستانبۆڵ دابەزین. ئێمە پانزە کەسمان بەرەو گەڕەکی (یەنی قاپی) براین لە ئاپارتمانێکی سێ ژووری نیشتەجێ کراین، کە قاچاغچییەکە بۆی ئامادە کردبووین، چەند رۆژێك پشووماندا، نەماندەتوانی بچینە دەرەوەی ئاپارتمانەکە، چونکە مەترسی دەستگیرکردن و سنورداش کردنەوەمان هەبوو، ئەو چەند رۆژە هەرچەندە پشوێکی باش بوو، بەڵام زیاتر لە زیندان دەچوو. بەشێکی ئەوەشی کە نەماندەتوانی بچینە دەرەوە هی ئەوەبوو شارەزای ئەو شارە نەبووین، شارەزابوون لەو شارە گەورەیەدا کارێکی سەختە و ئاسان نییە، شارێکی جەنجاڵ و فەرەباڵخ، هیچ کام لە ئێمە شوێنێکی هاوشێوەی ئەو شارەمان نەبینیبوو، بۆیە شەرم نەبوو کە لە ون بوونیش دەترساین. کاری ئێمە چاوەڕوانی رۆیشتن و گەیشتن بە وڵاتێکی ئارام بوو، بۆیە هەموو ساتەکان لە چاوەڕوانی فەرمانی قاچاغچییەکەمان بووین، ئەو چاوەڕوانییەش کۆتایی هات و رۆژێك قاچاغچییەکەمان ئاگاداری کردینەوە، کە کەلوپەل و پێداویستی رێگە ئامادە بکەین بۆ کەوتنە رێ بەرەو

ولاتـی یۆنـان.

لـە مـاوەی دوو ڕۆژدا تێکـڕای پێداویستییەکانمان کـڕی، کـە زۆربـەی خواردنـی لەقوتونـراو و گوێـز و خورمـا و سـەمون و نانـی وشـککراو بـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەسـتێك جلـی پـاك و پێـڵاوی تـازە، سـەرجەم کەلوپەلەکانمـان لـە نایلـۆن و تێـپ پێچـا بۆئـەوەی لـە ڕێـگا تـەڕ نەبێـت. جانتاکانمـان ئامـادە کرد، بەرەبەیانێك بـە چەند ئۆتۆمبیلێك گوازراینـەوە بـۆ دەرەوەی ئیسـتانبۆڵ، لـە شـوێنێك کـە دارسـتانێکی چـڕ بـوو کۆبووینـەوە، کامیۆنێـك لـەوێ وەسـتابوو، هەموومانیـان لـەو کامیۆنە سەرخست و بەرە و سـنوری یۆنان کەوتینە ڕێ. دوای چەند کاتژمێرێـك لـە سـنوری شـاری (کەشـان) گەیشـتینە سـنوری ولاتـی یۆنـان، ئێمـە چاوەڕوانـی پەڕینـەوە بوویـن بـەڵام قاچاغچییەکـە فێڵـی لـە ئێمـە کـرد و ئێمـەی نەپەڕانـدەوە و داوای لێکردیـن بگەڕێینـەوە ئیسـتانبۆڵ و چاوەڕوانـی ئـەو بیـن. ئێمـە چـوار کـەس بەجێمایـن قاچاغچیەکـە بـەو بیانـوە جێـی هێشـتین، کـە دڵنیا نییە لـە دەرچوون و بۆئـەوەی مەترسـی سنورداشـکردنەوەمان نەکەوێتـە سـەر، پێویسـتە لـە ئیسـتانبۆڵ چاوەڕێـی بکەیـن. ڕۆژی دواتـر بەدەردە سـەرییەکی زۆر خۆمـان گەیانـدەوە ئیسـتانبۆڵ و چوینـەوە هەمـان ئاپارتمـان، کـە دوو کەسـی لـێ مابوونـەوە. دوای چەنـد ڕۆژێـك هەواڵێکـی زۆر ناخۆشـمان پێگەیشت، ئـەو وەجبەیـەی، کـە ئێمەیـان بەجێهێشـت لەسـەر سـنوری یۆنـان، لەدەشـتاییەکانی شـاری (کۆمەتیـن)ی ولاتـی یۆنـان توشـی مەرگەسـات هاتبـوون. قاچاغچییەکەمـان کـە سـەرقافڵەی وەجبەکـەش

بوو کەوتبووە سەر لوغمێکی پاشماوەی جەنگی جیهانی دووەم و دەستبەجێ خۆی و دوو کەسی تر هەر لەوێ گیانیان لەدەستدابوو و چەند کەسێکیش بریندار بووبوون. دوای ئەو رووداوە حکومەتی یۆنان چوبوون بە هانایانەوە و تەرمەکانیان لە شاری (کۆمەتین) بەخاك سپاردبوو و نەفەرەکانیشیان گەیاندبوونە (ئەسینا)ی پایتەخت و برینداەکانیشیان چارەسەر کردبوو. ئەو هەواڵە بۆ ئێمە هەواڵێکی زۆر ناخۆش بوو، توشی شڵەژانێکی ئێجگار زۆری کردین، لەوکاتەدا هەموو رووداوەکانی رۆژانی رابردوومان بیر دەکەوتەوە، من راستەوخۆ کە هەواڵی کوژرانی قاچاغچییەکەم بیست خەیاڵم چۆوە سەر یەکەم دێڕی گرێبەستەکەی، کە لەگەڵ من ئیمزای کرد و بە(کل نفس ذائقة الموت) دەستی پێدەکرد.

تۆ بڵێی قاچاغچییەکە هەستی بەوە کردبێت، کە ئیتر لەکۆتاییەکانی ژیان نزیك بۆتەوە؟.

دوای چەند رۆژێك لەو رووداوە بڕیارماندا بیر لە رێگەی تر بکەینەوە و بە هەر شێوەیەك بێت خۆمان رزگار بکەین لە تورکیا، ئەو کارەش بۆ ئێمەی ناشارەزا لە وڵاتێکی بێگانە، کە هیچ کەسێکی لێ نەناسین سەخت بوو، بەڵام پێویستە هەوڵی باش بدەین، بەڵکو کەسێکی باش بدۆزینەوە و لەگەڵی رێك بکەوین تا رزگارمان بکات، بۆ ئەو مەبەستە لە رێی چەند کوردێك، کە ماوەیەکی زۆر بوو لەو شارە دەژیان چەند قاچاغچییەکمان بینی و گفتوگۆمان لەگەڵ کردن تا بە ئاسانترین شێوە بمانگەیەننە

(ئەسینا)ی پایتەختی یۆنان. لەگەڵ یەکێکیان رێککەوتین و دوای چەند رۆژێك کەوتینە رێ، نەگەیشتینە سەر سنوری یۆنان و دەستگیر کراین. دوای ئەوەی هەموو پارە و پێداویستیەکانیان لێ سەندین، لە شارۆچکەیەك ئازادیان کردین و بە چەرمەسەرییەکی زۆر خۆمان گەیاندەوە ئیستانبۆڵ. دیسانەوە دوای چەند رۆژێك خۆمان ئامادە کردەوە و لەگەڵ هەمان قاچاغچی کەوتینەوە رێ، ئەوجارە زۆر بە خێرایی گەیشتینە سەر ئاوی گەورە و بە بەلەمێکی چوپ، دوو دوو پەڕینەوە ئەوبەری خاکی یۆنان و توانیمان سنوری تورکیا و یۆنان ببڕین، ئیتر لەناو خاکی یۆنان بە پیادە کەوتینە رێ شەو تا بەیانی دەڕۆیشتین و بەیانیانیش تا ئێوارە خۆمان دەشاردەوە، قاچ و قولمان یەکپارچە بوو بوو بە برین، چونکە بەشێکی رێگاکە لەسەر هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر بوو، ئەو رێگەیەش بە بەردی بچوکی شکێنراو داپۆشراوە. بەردەکان لێوارەکانیان زۆر تیژ و بڕەر بوون. هەر زوو پێڵاوەکانمان هەلا هەلا بوون، هەشت شەو بەرێگادا رۆیشتین و گەیشتینە دەشتاییەکانی شاری (کۆمەتین)، ئێرە ئەو شوێنەیە کە قاچاغچیی و هاورێکانمان پێش چەند رۆژێك کەوتنە سەر لوغم و توشی کارەسات بوون. دەشتەکەی کۆمەتین دەشتێکی گەورە و پان و بەرین بوو، دار و درەختێکی زۆری هەیە و هەندێکیشی بیشەڵانە، بە ئەسپایی بەرێگادا دەڕۆیشتین، دەمانزانی بۆ دەستگیرکردنمان یەکێك لە ترسناکترین شوێنەکان ئێرەیە، ئەگەر ئێرە بە سەلامەتی

تێپەڕێنین ئەوا مەترسییەکی ئەوتۆ نامێنێت و بە ئاسانی دەگەینە ئەسیناى پایتەخت. نیوە شەوێك زۆر بە ئارامی دەڕۆیشتین، نە کەس دەیتوانی قسە بکات و نە کەس دەیتوانی جگەرە بکێشێت، تەنانەت نەدەبوو دەنگی قاچیشمان بێت. شەوێکی تاریك و سامناك بوو، پێشتر قاچاغچییەکە لەوە ئاگاداری کردبووینەوە، کە ئەگەری زۆر هەیە بۆسەی پۆلیس هەبێت، بۆیە تکای زۆری کرد، کە بێدەنگی بپارێزین و بە ئارامی بەڕێدا بڕۆین، هێندەی نەبرد لەگەڵ هاواری پۆلیس و راکێشانی میلی چەکەکانیان هەموومان راچڵەکین، هەر یەکە و بەلایەکدا رایکرد، من و یەکێك لە هاورێکانم بەرەو پێشەوە رامانکرد، تا بەرەبەیان بەردەوام بووین لە راکردن و دوور کەوتنەوە لە شوێنی رووداوەکە. نەمان دەزانی کێ گیراوە و کێ رزگاری بووە، چونکە شەوێکی ئەوەندە تاریك بوو تەنها بە دەنگ زانیمان کە کەوتوینەتە بۆسەی پۆلیس. ئەوەی جێی دڵخۆشی بوو دەمانزانی کەس زیانی گیانی بەرنەکەوتووە، چونکە هیچ تەقەیەك نەکرا تەنها گوێمان لە هێنانەوەی میلی چەکەکان بوو، بەڵام کەس تەقەی نەکرد. بەرەبەیان شوێنێکمان دۆزیەوە و لەبەر هیلاکی خەومان لێکەوت تا دەمەو نیوەڕۆ بە دەنگی پۆلیس خەبەرمان بۆوە، کە چاومانکردەوە پۆلیسەکان بەسەر سەرمانەوە بوون، لەوێ دەستگیر کراین و گوازراینەوە بۆ زیندانی پۆلیسی شاری کۆمەتین. لەوێ تێکڕای هاورێکانمان بینیەوە، دەرکەوت کەس رزگاری نەبووە و هەمووی دەستگیر کراوە.

دوای دوو رۆژ گوازراینــەوە بــۆ شــارۆچکەی (فێــریّ)ی ســەر ســنوری تورکیــا٠ ئــەو ســیّ رۆژەی لــە زیندانەکانــی یۆنــان بوویــن هیــچ جــۆرە ئازارێــك نەدرایــن، تەنانــەت پرســیارێکیان لــیّ نەکردیــن٠ لــە زیندانــی فێــریّ دوو کــەس بــە روخســاری داپۆشــراو هاتنــە نێــو زینــدان، وا دیــار بــوو ســەر بــە پۆلیســی یۆنــان بــوون، ســەیری یــەك بەیەکــی زیندانییەکانیــان کــرد، دوای چەنــد خولەکێــك بــیّ ئــەوەی پرســیارێك بکــەن رۆیشــتنە دەرەوە٠ یەکێــك لــە زیندانییــەکان ماوەیەکــی زۆر بــوو لــەو رێگایــەی دەدا و دەرنەدەچــوو، زۆر هێنابویــان بــۆ ئــەو زیندانــە٠ ئــەو زانیــاری لەســەر ئــەو دوو کەســە هەبــوو، ئــەو وتــی هەردوکیــان کــوردن و یەکێکیــان نــاوی (ســوتەیە) و ئــەوەی تریــش نــاوی (عەدنــان) ە ئــەوان ســەر بــە پۆلیســی یۆنانــن و تەنهــا بــەدوای قاچاغچییەکانــدا دەگەرێــن و دەستنیشــانیان دەکــەن بــۆ پۆلیــس و دەیانــدەنــە دادگا٠ ئــەوە زانیاریێکــی ســەیر بــوو بــۆ ئێمــە، ئاخــر چــۆن دەشــیّ کوردێــك ئــەو کارانــە بــکات بــۆ وڵاتێکــی ئەوروپــی وەك یۆنــان!٠ زیندانــی شــارۆچکەی فێــریّ ناونرابــوو (محەتــە) ســەر دیوارەکانــی هەمــووی بــە کــوردی نووســرابوو، ناوێکــی ئێجگار زۆری گەنجانــی کــورد لەســەر دیــواری ئــەو ژوورە نووســرابوو، نــاوی چەنــد کەســێك لــە هــاوریّ و ناســیاوم بەرچاوکــەوت٠ ئێمــەش هەریەکەمــان لــە ســوچێکی دیــوارەکان ناوەکانمــان نووســی وەك یــادگاری٠ ئێمــە زۆر لــەو زیندانــە نەماینــەوە و هــەر ئــەو شــەوە هەڵیاندایــنەوە ســەر خاکــی تورکیــا٠ دەبوایــە لەنێــو خاکــی تورکیــا کارێــك بکەیــن دەســتگیر نەکرێیــن، ئەگــەر دەســتگیر

بکرێیـن ئـەوا هەڵمـان دەدەنــەوە سـەر خاکـی یۆنــان و ئەوانیـش دیسـان هەڵمـان دەدەنــەوە سـەر خاکـی تورکیـا، ئـەو هەڵسوکەوتەی تورکیـا و یۆنـان ناونرابـوو (تۆپانـێ)٠ بۆیـە هەوڵێکـی زۆر باشـماندا کـە نەکەوینـە تۆپانـێ و خۆمـان لـە چنـگ پۆلیـس و جەندرمـەی تورکـی رزگار کـرد و چوینـە نزیـك گوندێـك و لـە نێـو کوخێـك خۆمـان شـاردەوە تـا رۆژ بـۆوە، ئینجـا گەڕاینـەوە بـۆ ئیسـتانبۆڵ٠

دوای گەیشتنەوەمان بـە ئیستانبۆڵ، بڕیارمـدا، کـە هـەم قاچاغچـی و هـەم ڕێگاکـەش بگـۆڕم و هـەوڵ بـدەم بـە ڕێگەیەکـی تـر خـۆم دەربـاز بکـەم، بۆیـە جارێکـی تـر لەگـەڵ چەنـد قاچاغچییـەك کەوتمـەوە گفتوگـۆ، دواجـار بڕیارمـدا لەڕێگـەی دەریـاوە خـۆم بگەیەنمـە یۆنـان٠ ئـەو کاتـەی مـن لـەوێ بـووم چەندیـن کـەس بـە ڕێگـەی دەریـا رزگاریـان بـوو و گەیشـتنە ئەسـینا، تێچوەکـەی زیاتـر بـوو، بـەڵام نەمانبیستبوو کـەس گەڕابێتـەوە یـان گیرابێـت٠ دوای گفتوگـۆ و ڕێککەوتنـم لەگـەڵ قاچاغچییـەك، چومـە ئـەو ئاپارتمانـەی کـە نەفەرەکانـی قاچاغچییەکـەی لێبـوو، زیاتـر لـە سـی کـەس لـەوێ دەژیـان٠

دوای پێنـج رۆژ مانـەوە لـەو ئاپارتمانـە، پێشـنیوەڕۆی ٧-٧-١٩٩٧ هەموومـان لـە ئوتوبوسـێك سـەرکەوتین و بـەرەو شـاری (ئیزمیـر) کەوتینـە رێ و لەوێشـەوە بـەرەو کەنـاری دەریـای (ئیجـە)٠ لـە نیـوەی رێـگا ئۆتۆمبێلەکـەی ئێمـە وەسـتا، دوای چەنـد خولەکێـك ئۆتۆبوسـێکی تـری پـڕ لـە نەفـەر هـات و لەبـەردەم ئۆتۆمبێلەکـەی

ئێمە وەستا، لە جامی ئۆتۆمبێلەکەوە خزمێکی خۆمم بینی بەناوی نەسرەدین کەرکوکی. بە هێما سڵاومان لەیەکتر کرد، نەسرەدین داوای لێکردم بچمە ئۆتۆمبێلەکەی ئەوان و بەیەکەوە بین، چونکە لەوە تێگەیشتین کە بڕیار وایە هەمووومان پێکەوە بە بەلەمێك بپەڕینەوە، بەڵام قاچاغچییەکە ڕێگەی نەدا بەبیانوی ئەوەی نەفەری نێو پاسەکەی تر وەجبەی قاچاغچییەکی ترن و گوتی نابێ تێکەڵ بن، تا دەگەینە کەنار دەریا دوو وەجبەی جیاوازین و هەریەکەمان بەرپرسیارێتی وەجبەی خۆی هەڵدەگرێ. دوای چەند خولەکێك ئۆتۆمبێلەکان بەرەو کەنار دەریا کەوتنە ڕێ، ئۆتۆمبێلەکەی ئێمە لە دواوە بوو، دوای دوو کاتژمێر نزیك بووینەوە لە کەنار دەریا، لە نێو دارستانێکی چڕ و بە جادەیەکی باریکدا ئۆتۆمبێلەکەمان بە هێواشی دەڕۆیشت، ئەو ئۆتۆمبێلەی تر نەختێك خێراتر ڕۆیشتبوو و ئێمەی جێ هێشتبوو. لە ناکاو ئۆتۆمبێلەکە وەستا، شوفێر زۆر هەوڵیدا بە تەلەفۆن پەیوەندی بە ئۆتۆمبێلەکەی پێشەوە یان قاچاغچییەکان بکات، کە قاچاغچییەکان لە ئۆتۆمبێلێکی بچوك سەرکەوتبوون، بەڵام بەهۆی نەبوونی خزمەتگوزاری پەیوەندی هیچ تەلەفۆنێکی پێ وەرنەگیرا. لەنێو سەرنشینەکان دوودڵی دروست بوو، ئاخۆ چی ڕوویداوە ئێمە بۆ وەستاوین! من نەختێك تورکیم دەزانی، بۆیە داوایان لێکردم، کە پرسیار بکەم ئاخۆ گرفت چییە و بۆ وەستاوین؟! چومە لای شوفێرەکە و لێم پرسی کێشەمان چیە بۆ وەستاوین؟ شوفێر وتی

سەیری بەردەممان بکە لێرە جادەکە دەبێت بە دوو دانە یەکیان بۆ سەرەوە دەڕوا و ئەوی تریان بۆ خوارەوە، کە سەیرم کرد درەختێکی گەورە لە ناوەڕاستی ڕێگاکەدا بوو و جادەکەی کردبوو بە دوان. ئەو گوتی نازانم ئەوانی تر بۆ کامەلا ڕۆیشتوون. سەرنشینەکان داوایانکرد، کە بکەوێتە ڕێ و لایەکیان هەڵبژێرێ، ئەو ڕەتی کردەوە ئەو کارە بکات بە بیانوی ئەوەی ڕەنگە هەڵە بکەین و بکەوێتە داوی پۆلیس لە ڕاستیشدا مافی خۆی بوو، چونکە بەو شێوەیە گیرابوایە، جگە لەوەی سزاکەی دە بۆ پانزە ساڵ زیندانی بوو، ئەوا ئۆتۆمبێلەکەشی لەدەست دەدا و دەبووە موڵکی دەوڵەت. بۆیە وەستاین و زیاتر لە کاتژمێر و نیوێک چاوەڕێمانکرد، نە ئۆتۆمبێلی قاچاغچییەکان گەڕایەوە و نە هی نەفەرەکانیش. دوای کاتژمێر و نیوێک ئۆتۆمبێلێک لە پشت سەرمانەوە دەرکەوت، شوفێرەکە دابەزی و داوای لێکردن ڕێگەی کەنار ئاوەکەی نیشان بدەن. ئەوان ڕێگەی خوارەوەیان دەستنیشانکرد و گوتیان تەنها لەو ڕێگەیەوە دەتوانن بگەنە کەنار دەریا، دوای ئەوە ئۆتۆمبێلەکەمان کەوتە ڕێ و دوای چەند خولەکێک ئێمەش گەیشتینە کەناری دەریا. تەواوی سەرنشینەکانی ئۆتۆمبێلەکەی تر لە بەلەمێکی گەورە سەرکەوتبوون و لەگەڵ دابەزینی ئێمە لە ئۆتۆمبێل بەلەمەکەش کەوتە ڕێ، چەند هاوارمانکرد نە ئێمەیان بینی و نە گوێیان لە دەنگمان بوو، دوای چەند خولەکێک بەلەم بەرەو قوڵایی دەریا ڕۆیشت و لە بەر چاوی ئێمە ون بوو. ئیتر لەگەڵ

قاچاغچییەکان کەوتینە گفتوگۆ، ئەوان چوار کەس بوون دوانیان کورد بوون و دوانیشیان تورك، پێیان وابوو ئێمە کەوتوینەتە بۆسەی پۆلیس و دەستگیر کراوین، بۆیە ئەوانیش نەیانوێراوە بگەڕێنەوە بەدوامانـدا، دوای گفتوگۆیەکی زۆر بەڵێنیانـدا، کە ئەو شەوە ئێمە هەر لەوێ بمێنینەوە و ڕۆژی دواتر بەلەمێکی ترمان بۆ بێنن و بمانپەڕێننەوە، گوتیان ئەمشەو خواردن و ئاوتان بۆ دەهێنین و سبەی ئێوارە بەلەم دێت و دەتانپەڕێنێتەوە، سەرەتا هەموومان دوودڵ بووین و بڕوای تەواومان بە بەڵێنەکانیان نەبوو، ئەوانیش تادەهات زیاتر بەڵێنیان دەدا و پێداگریان دەکرد، بۆیە دواجار بڕیارماندا و هەموومان بە داواکارییەکەیان رازی بووین. درەنگانی شەو قاچاغچییەکان هاتنەوە و خۆراك و پێداویستی مانەومیان بۆهێنایـن، ئەو شەوە بە بێدەنگی هەریەکە و لەژێر درەختێك پاڵکەوتین، کە ٣٦ کەس بووین، چوار خێزانمان لەگەڵ بوو، خێزانێکی عەرەب بەناوی ئەبو عەلی لە حەوت کەس پێکهاتبوون و خەڵکی خوارووی عێراق بوون، سێ خێزانی کورد، کە خەڵکی پارێزگای هەولێر بوون، کە هەریەك لە عەقید فارس دزەیی، نیاز هەولێری و خێزانی عوسمان خۆشناو، ئەو خێزانانە شەشیان منداڵ بوون، کچەکەی کاك نیاز ناوی (سافۆ) بوو، زۆر خوێن شیرین و قسەخۆش بوو، تەمەنی پێنج ساڵان دەبوو، دایکی ناوی بێخاڵ بوو، من زۆر لەگەڵ ئەو خێزانە تێکەڵاو بووم، بەدرێژایی ئەو پێنج ڕۆژەی لە ئاپارتمانەکە پێکەوە بوین و ئەو

دوو شەوەی لە کەنار دەریاماینەوە، سافۆ هەر بە باوەشی منەوە بوو. نە ئەو بێتاقەت دەبوو لە یاری و پرسیارکردن، نە منیش بێتاقەت دەبووم لە یارییەکان و پرسیارەکانی. ئەو شەوە سافۆ لەباوەشی من نەهاتەدەر و هەرچەند دایك و باوکی لێی پاڕانەوە، بەڵام ئەو رازی نەبوو لە باوەشی من بێتە دەرەوە. ئەو لەبارەی دەریا و ماسی و مەلەکردن پرسیاری لەمن دەکرد و منیش باسی خۆشەویستی ماسی بۆ دەریا و جوانی دەریام بە ماسییەوە بۆ سافۆ دەکرد. بەڵێنی ئەوەشم پێدا، کە رۆژ بۆوە بیبەمە نێو ئاو و شەڕە ئاوی لەگەڵ بکەم، سافۆ زۆر پێداگر بوو، کە من لەسەر بەڵێنەکەی خۆم بم، منیش بە ئارامی بەڵێنەکەم بۆ دووپات دەکردەوە، هەر دەمەویست سەرقاڵی بکەم، کە لە تاریکی کەنار دەریا و تارمایی درەختە چڕ و بەرزەکان و هاژەی شەپۆلەکان نەترسێ تا وایلێهات هەر لەباوەشم خەوی لێکەوت و دواتر بردمەوە لای دایك و باوکی. ئەو شەوەمان لەژێر درەختەکانی کەنار دەریا بەڕێکرد، هەرچەندە ئێمە چەند کەسێکمان زۆر بەکەمی خەومان لێکەوت، بەڵام رۆژمان کردەوە و لەچاوەڕوانی ئەوەدابووین، کە رۆژێکی تر لە وڵاتێکی تر و لە شوێنێکی ئارام و بێ مەترسی بکەینەوە. رۆژ بۆوە و دەمەو نیوەڕۆ لەگەڵ چەند هاوڕێیەك چوینە نێو ئاوەکە و دەستمان کرد بە مەلەکردن، سافۆ لەباوەشم بوو تا ئێوارە لەنێو ئاوەکە یاریمانکرد. وابڕیار بوو ئەو ئێوارەیە بەلەمێکمان بۆ بێت و بکەوینە رێ، بەڵام بەلەم

دەنگی نەبوو و دەرنەکەوت. پێش تاریک بوون قاچاغچیەکان هاتن و داوای لێبوردنیان کرد، کە ئەوشەوە ناتوانین بپەڕینەوە، چونکە بەلەمەکە ئامادە نەبووە، بەڵام بۆ رۆژی دواتر پێش نیوەڕۆ بەلەمەکە دەگاتە لامان. نارەزایی زۆرمان نیشاندا و گفتوگۆی زۆرمانکرد، دواجار قاچاغچییەکان چەند جارێك دڵنیایان کردینەوە، کە رۆژی دواتر بە دڵنیایی بەلەمەکە دەگاتە لامان. دوای تەواوبوونی ئەو گفتوگۆیە قاچاغچییەکان گوتیان بەلەمی دوێنێ شەو بە سەلامەتی گەیشتە نێو خاکی یۆنان و ئەوەش هەواڵێکی خۆشبوو بۆ ئێمە، چونکە پێمانوابوو رێگاکە سەلامەتە و پەڕینەوەش ئاسانە. ئەو شەوەشمان لەگەڵ هاوڕێیان بەتایبەت کاك عقید فارس دزەیی بردەسەر. ئەو پیاوە باسی قۆناغەکانی ژیانی خۆی بۆ دەکردین، ناوە ناوەش دەیگوت گێرانەوەی سەختی ژیانم بۆ ئەوە نییە بێ هیواتان بکەم، ئەو قۆناغەی ئێمە تیایدا ژیاوین جیاوازە لەم سەردەمەی ئێستا، ئێوە گەنجن دەتوانن ژیانێکی شایستە بۆخۆتان بونیاد بنێن. قسە شیرین و پڕ لە ئەزموونەکانی عقید فارس شەوی درەنگ کرد و ئیتر هەرکەس بۆ لانەی خۆی چوو، کە لەژێر درەختەکاندا بۆخۆمان دروستمان کردبوو.

رۆژی دواتر دەمەو نیوەڕۆ لە دوورەوە بەلەمێکمان بینی بەرەو ئەو کەنارە دەهات، کە ئێمەی لێبووین. وردە وردە لێمانەوە نزیك بۆوە، ئیتر بڕوای تەواومان بەوە بوو ئەوە ئەو بەلەمەیە، کە بۆ

ئێمـە ئامـادە کـراوە و هاتـووە بـەدوای ئێمـەدا و ئیتـر ئەمشـەو خۆمانی رادەست دەکەین و ئەویش دەمانگەیەنێتە ئەو مەملەکەتەی، کـە خـەوی پێـوە دەبینیـن· دوای چەنـد خولەکێك بەلەمەکـە نزیـك بـۆوە لـە کەنـار دەریـا و لەنگـەری گـرت، بەتـەواوی نەهاتـە کەنارەکـە و چەنـد مەترێـك دوور بـوو· تێگەیشـتین، کـە ئـەوە ئـەو بەلەمەیـە کـەوا بڕیـارە فۆناغێکـی تـر نزیمـکان بکاتـەوە لـەو نیشـتمانەی، کـە بڕیـارە بـۆ تاهەتایـە بیکەینـە نیشـتمانی خۆمـان· وادەرچـوو دوای نیـوەڕۆ قاچاغچییـەکان هاتنـەوە، ئـەوان چـوار کـەس بـوون، دوو کـورد و دوو تـورك، هەندێـك خـواردن و پێداویسـتییان بـۆ هێنابوویـن و پێیان راگەیاندین، کە ئەوە بەلەمەکەتانە و ئەمشەو دەتانپەڕێنێتەوە ئەوبـەری یۆنـان، هەمووومـان بـەوە دڵخۆش بووین کـە ئامادەکارییەکان بـاش بەڕێـوە چـوون بـۆ سـەفەرەکەمان· ئـەو رۆژە تێکڕامـان لـە نزیـك ئـەو ئاگـرە کـزە دانیشـتبووین، کـە قۆرییـە چایەکـەی لەسـەر بـوو و هەریەکـە لـە پەرداخێکـی پلاسـتیکیدا چایەکـی بەدەسـتەوە گرتبـوو· گفتوگـۆ بـوو لەبـارەی ئـەوەی کـە کـێ دەچێتـە کامـە وڵات، هەموویـان بڕیـاری یەکلاکەرەوەیاندابـوو و وڵاتێکیـان دیـاری کردبـوو، کـە لێـی بژیـن تەنهـا مـن و شـوانە نەبێـت· شـوانە زۆر بـە خۆشـی رووی کـردە دەریاکـە و گوتـی خـوادەکا لـەو دەریایـە رزگارم دەبێـت، تـا نەگەمـە ئەسـینا بیـر لـەوە ناکەمـەوە کـە بچمـە کام وڵات، بـە پێکەنینـەوە گوتـی لـەوێ دوو رۆژ بـەس دادەنیشـم و دەخـۆم و دەنـوم، ئینجا بیـر دەکەمـەوە، کـە بچمـە کـوێ· هەرچەنـد پرسـیاریان لـە مـن

کرد من هەر گوتم نازانم، چونکە دەمەوێ لە یۆنان گفتوگۆ لەگەڵ کەسوکارم بکەم و ئەوان ڕێنوێنیم بکەن، کە بچمە کوێ و لەکوێ بمێنمەوە· لە راستیشدا هەر وابوو، چونکە تا ئەوساش نەمدەزانی کوێ بە ئاسانی مافی پەنابەریم پێ دەدات· ئێوارە ·درەنگ داهات و وردە وردە ئێمە خۆمان ئامادەکرد بۆ سەرکەوتن لە بەلەمەکە· تا ئەوکاتە کەس بیری لە مەترسییەکان نەکردبۆوە، بەڵام هەر لە ئێوارەوە پۆلیسی تورکیا لەو سنوورە بە چەندین بەلەم دەسوڕانەوە تا کاتژمێر دەی شەو، ترس و سەرنجی ئێمە تەنها لەسەر پۆلیسەکان بوو، دوای ئەوەی پۆلیسەکان ڕۆیشتن ئێمەش ئەو ترسەمان نەما و ئاسودە بووین· قاچاغچییەکان داوایانکرد بەرەو بەلەمەکە بڕۆین، بەلەم چەند مەترێك لە کەنارەوە دوور بوو، دەبوایە بە پێ بڕۆین، کە نزیك بە مەترێك قوڵ دەبوو تا دەگەیشتینە بەلەمەکە· من جلەکانم بەتەواوی داکەند و تەنها جلی مەلەم لەبەردا مابوو، من و سامان رەئوف و شوانە یەکە یەکە منداڵەکانمان لەسەر شان دانا و بەرەو بەلەمەکە بردمانن· هەموومان لە بەلەم سەرکەوتین جگە لە محەمەد هەولێری نەبێت، محەمەد برای یەکێك لە وەستا ناسراوەکانی ئۆتۆمبیل بوو لە هەولێر ئەویش وەستا یاسینی وایەرمەنە، وەستا یاسین هاوڕێی باوکم بوو، لەکەناری دەریا بە محەمەدی برای ئاشنا بووم· تەنها محەمەد لەبەلەمەکە نزیك نەبۆوە، لەگەڵ قاچاغچییەکە کەوتە گفتوگۆ، زۆر پێداگریکرد کە ئەم بەلەمە

بەکەڵکی ئەو سەفەرە نایەت، قسەکەی محەممەد راست بوو، بەلەمەکە زۆر کۆن بوو تەنها بۆیە کرابۆوە، قەبارەشی زۆر گەورە نەبوو، دوانزە مەترێک درێژ دەبوو و رەنگە سێ مەترێک پان بوبێت· بەهەرحاڵ سی و شەش کەس سواری ئەو بەلەمە بچووکە بووین، محەممەد ناهەقی نەبوو هەر دەیگوت باری ئەو بەلەمە قورسە، بڕوام وانیە بتوانێت بمانگەیەنێتە هیچ شوێنێك، هەرچەند ئێمە و قاچاغچییەکە گفتوگۆمان لەگەڵی کرد رازی نەبوو سواری بەلەمەکە بێت، محەممەد سێجار پێیگوتم بەباشی دەزانم تۆش سەرنەکەویت و لەگەڵ ئەو بەلەمە نەڕۆیت، بەلام من پێداگریم کرد، دواتر محەممەد پەشیمان بۆوە لەوەی من رازی بکات بۆ ئەوەی بەو بەلەمە سەفەر نەکەم· گوتی بڕیار بەدەستی خۆتە، رەنگە بەسەلامەتی بگەن و ئەوکاتە گلەیی لەمن دەکەیت، کە پەشیمانم کردییەوە، بۆیە خۆت بڕیار بدە· لە راستیدا من بڕیاری خۆمدابوو، هیچ ترسێکیشم لە بەلەم و دەریا نەبوو، بۆیە دوای چەند خولەکێك ماڵئاواییمان لە محەممەد و قاچاغچییەکان کرد، ئەوان بەرەو ئۆتۆمبێلەکەیان رۆیشتن و بە بەلەمەوانەکەیان گوت دوای ٢٠ خولەکی تر بکەوە رێ· لەو کاتەدا کە چاوەڕوانی جوڵەی بەلەمەکە بووین، سەرنجمدا قسە و بیر و بۆچوونەکانی محەممەد کاریگەری خستبۆ سەر نەفەرەکان و هەندێکیانی تووشی دڵە راوکێ و دوودڵی کردبوو، گفتوگۆیەکی چڕیش دروستبوو، هەر یەکە و رای خۆی دەگوت· یەکێ پێی وابوو بێ گومان ئەو شەوە

دەگەینــە کەناراوەکانــی یۆنــان و یەکێکیــش دەیگــوت دەگیرێیــن و ڕەنگــە بۆســەی پۆلیســی دەریایــی هەبێــت، چونکــە تــا کەمێــک پێــش ئێســتا ژمارەیەکــی زۆری پۆلیــس لەنێــو دەریــا و ســەر ڕێگــەی ئێمــە هەبــوون، هەندێــک پێیــان وابــوو ســەفەری شــەو بــە پێــی پەنــدە کوردییــەکان پەســند نییــە، هەندێکیــش شــەویان بــە (قــەڵای مێــران) نــاو دەبــرد و پێیــان وابــوو ســەرکەوتنی مرۆڤــەکان لەشــەودا مسۆگەرتره. هەمووومــان ترســە گەورەکەمــان دەشــاردەوە، ئاخــر کــەس باســی نقومبــوون و مردنــی نەدەکــرد، کەچــی هەمــووی ئــەو ترســەی بەروخســارەوە دیــار بــوو، بەتایبــەت دوای قســەکانی محەمــەد. لــەم کەیــن و بەینــەدا بــوون، کــە دەنگــی ماتــۆڕی بەلەمەکەمــان بــەرز بــۆوە و وردە وردە لــە کاتــی دیاریکــراوی وەڕێکەوتــن نزیــک دەبووینــەوە، دەنــگ و دووکەڵــی ماتــۆڕی بەلەمەکــە تــا دەهــات زیــادی دەکــرد و بــەرز دەبــۆوە، هەمووومــان لــە چاوەڕوانــی جوڵــەی بەلەمەکەدابوویــن، لەڕاســتیدا تــا ئەوســاتەش مــن هیــچ هەســتێکم نەبــوو، ڕاســتتر بڵێــم بیرکردنەوەکانــم زۆر جەنجاڵ و تێکەڵ بــوون، بیرم لەوە نەدەکردەوە ئاخــۆ دەردەچیــن یــان نــا، هیــچ هەســتێکم نەبــوو و بیــرم نایــەت لــەو ســەروبەندەدا بیــرم بــەلای ئــەوەدا چوبێــت بترســم. بەلەمــەوان گوتــی کاتــی کەوتنــە ڕێ هــات و پێویســتە بکەوینــە ڕێ، تکایــە هەرکەســە و لــە شــوێنی خــۆی دانیشــێت و جوڵــە نــەکات. بەلــەم وردە وردە ملــی ڕێــی گــرت، ســەرەتا زۆر بــە هێواشــی بــەرەو قوڵایــی دەریــا دەڕۆیشــت ئــارام و بــێ کێشــە، ئــەو ڕۆیشــتنە ئارامــە دوای نیــو کاتژمێــر کۆتایــی

هات و ئیتر له شەپۆلەکان نزیك دەبووینەوە و تێکەڵاویان دەبووین. لەوکاتەدا، کە کەوتینە نێو شەپۆلەکان هەموومان لە یەکتریمان دەپرسی و دەمانگوت ئەم شەپۆلانە چین؟ ئێوارە دەریا زۆر ئارام بوو، خۆ شەپۆلێکی بچوکیشی نەبوو ئەی بۆ وای لێهات و دەریا بۆ وا دەمانترسێنێ! هەموومان کەوتینە گلەیی لە دەریا، ئاخر بۆ دەبێ لەم ماوە کەمەدا دەریا ئاوا تورە بێت؟ لەراستیشدا ئێمە شارەزاییمان نەبوو لە دەریا، نەماندەزانی لەکوێ و کەی دەریا شەپۆلەکانی زیاد و کەم دەبن. تا بەرەو قوڵایی زیاتر دەچوین بەلەمەکە لەنێو شەپۆلە تورەکانی دەریا دەکەوتە سەما و هەڵبەز و دابەزی زیاتر، پەشیمانی هاتنی ئەو سەفەرە بەهەموومانەوە دیار بوو، رای زۆربەمان گۆڕا و سەرکۆنەی خۆمان دەکرد، کە هەڵە بووین لە هەڵبژاردنی رێگەی دەریا و بەتایبەتیش چۆن رازی بووین سواری ئەو بەلەمە بین.؟ دوای کەمێك کە ترس بەسەر هەموماندا زاڵ بوو جگە لە دەنگی ماتۆڕی بەلەم و هاژەی شەپۆلی دەریا هیچ دەنگێکی تر نەدەهات، ٣٦ کەس لەنێو بەلەم سەیری یەکتریان دەکرد و هەر هەموومان لە ترس زیاتر شتێکی تر بە روخسارمانەوە دیار نەبوو. دوای کەمێکی تر رۆیشتن بەنێو شەپۆلە تورەکاندا دوعا و خوێندنی ئایەت کورسی و پاڕانەوە لەهەموو لایەك دەستی پێکرد، تا دەهات ترس زیاتر باڵی بەسەر هەمووماندا دەکێشا. بەلەمەوان چەند جارێك دڵنیای کردینەوە و داوای لێکردین، کە ئەوەی روودەدات زۆر ئاساییە و

کەس ترسی نەبێت و خۆتان مەشڵەژێنن، داوایکرد کەس لە شوێنی خۆی هەڵنەستێت و هاوسەنگی بەلەمەکە تێک نەدەن. کاتێک لە بەلەمەکە سەرکەوتین، بەلەمەوان خۆی شوێنی سەرنشینەکانی دیاری کرد، چەند منداڵێک دەستیانکرد بەگریان، وادیاربوو کاریگەری ترسی گەورەکانیان بەسەرەوە بوو، ئەوان کە بینیان ژن و پیاوەکان ترس دایگرتوون زیاتر ترسان، بەڕاستیش بۆئەوان مەترسیدارتر بوو. منداڵەکانیان بردنە بەشی خوارەوەی بەلەمەکە، کە تەنها جێی منداڵی تێدا دەبۆوە، چونکە بنمیچێکی زۆر نزمی هەبوو لە نیو مەتر زیاتر نەدەبوو. نازانم شەو بۆ هێندە تاریک داهات، خۆ ئەو دوو شەوەی لە کەنار دەریاکەدا بووین هێندە تاریک نەبوو، ئاسمان رووناک و دەریاش دەدرەوشایەوە، لەلایەکی ترەوە بیرمان لەوە دەکردەوە دوو شەوی رابردوو دەیان بەلەمی گەورە و بچوکمان لەو ناوە دەبینی، ئەی ئێستا بۆ هێندە چۆڵە و یەک بەلەم بەو ناوەدا ناڕوات! ناوە ناوە شەپۆلێکی تورە دەیهەژاندینەوە و ترس و دڵەڕاوکێی چەند هێندە زیاد دەکردین، لەگەڵ هەر بەرزبوونەوە و دابەزینێک دەنگی دوعا و پاڕانەوەکان زیاتر دەبوو. ئەبو عەلی دەستی کرد بە قورئان خوێندن بە دەنگێکی بەرز، لەو کاتەی ئەبو عەلی دەستی بە قورئان خوێندن کرد هەموومان بێدەنگ دانیشتبووین، دەستمان بە لێواری بەلەمەکەوە توند گرتبوو، لەگەڵ هەر شەپۆلێک ئاو بەسەرماندا دەباری. بەلەم لە چەندین شەپۆلیدا و هیچ رووینەدا، بۆیە

نەختێك تـرس و  دڵەڕاوكـێ كـەم بـۆوە، بڕوامـان بـەوە هێنـا، كـە بارودۆخەكـە ئاسـاییە وەك چـۆن بەلەمـەوان گوتـی دەریـا كـوا بـێ شـەپۆل دەبێـت! تـا ئـەو كاتـەی منداڵـەكان لـە بەشـی خـوارەوەی بەلەمەكە كردیانـە هاوار هاوار و گوتیـان ئـاو هاتـە نێـو بەلەمەكـە٠ دیسانەوە شـڵەژانێكی زۆر خراپتـر دروستبوو، داوامـان لـە شـوفێرەكە كـرد بگەڕێتـەوە، بـەڵام ئـەو هەمـوو شـتێكی بـە ئاسایی وێنـا كـرد و گوتـی ئاوەكـە و بـەرز و نزمبوونـەوەی  بەلەمەكـەش ئاسـاییە و خۆتـان مەترسـێنن، گەڕانــەوە و بەردەوامبوونیـش وەك یـەك وان، چونكـە لـە ناوەڕاسـتی ڕێگاكەیـن، لـە ڕاستیشـدا قسـەی بەلەمـەوان ڕاسـت بـوو  كـوا دەریـا بـێ شـەپۆل دەبێـت و گەڕانـەوەش بەنێـو ئـەو هەمـوو شـەپۆلە گەورانـەدا بڕیارێكـی دروسـت نییـە، خـۆ دەبـێ بەلەمیـش بـەرز و نزمییێـك بـكات٠ سـەتڵێكی دایـە دەسـتمان و داوایكـرد وردە وردە ئاوەكـە فڕێبدەینـەوە نێـو دەریـا، بۆیـە بەخێرایی ئـەو كارەمانكـرد و دەسـتمانكرد بـە فڕێدانـی ئاوەكـە بـۆ دەرەوە، بـەڵام تـا دەهـات ئاوەكـە زیـادی دەكـرد و مەترسـی زیاتـری دەخستە سـەرمان٠ شـوفێریش لەسـەر ڕۆیشـتن بەردەوامبـوو، ئـەو پێیوابـوو بارودۆخەكـە ئاساییە و هەمـوو شـتێك لـە كۆنتـڕۆڵی ئەودایـە، بـەڵام لـە ڕاسـتیدا وانەبـوو، بەڵكـو تـا دەهـات بـارودۆخ سـەختتر دەبـوو، لەگەڵ ئەوەشـدا دەنگـی گریانـی ژن و منداڵەكان هێنـدەی تـر بڕسـتی لـێ دەبڕیـن٠ شـەپۆلەكانی دەریـا تـا دەهـات بـێ بەزەیـی و تـوڕە و بەهێزتـر دەبـوون و بەلەمەكـەش تـا دەهـات نزمتـر دەبـۆوە٠ هەندێك

پڕ بەدەمیان هاواریان دەکرد بۆ بەهاناوە هاتنمان، هەندێك دەگریان و ئەوانەی تریش دوعایان دەکرد، ئەبوعەلیش هەر بەردەوام بوو لەسەر قورئان خوێندن بە دەنگێکی بەرز. دوای نزیك بە کاتژمێرێك لە ڕۆیشتن بۆ قوڵایی دەریا، تا دەهات هاوار هاواری پاڕانەوە و هاواری فریاکەوتن زیاتر بەرز دەبۆوە، شەپۆلەکان بەزەییان نەما، نە گریان و نە دوعا و نە هاوار کردن بۆ بەهاناوە هاتنمان دادی نەدایـن و شەپۆلێکی بەهێز لێیدایـن، هەموومـان کەوتینە لایەکی بەلەمەکەوە، بەڵام ئەو جارەش بەلەم و ئێمەش ڕزگارمان بوو. دایك و باوکەکان لەئێمە زیاتر نیگەران بون، لە هەوڵی ئەوەدابوون منداڵەکانیان یان بێننەوە لای خۆیان یان ئەوان بچنە لای جگەرگۆشەکانیان. شوفێر هاواریکرد کە نەشڵەژێین و هەرکەسە و بۆ پاراستنی هاوسەنگی بەلەم بچێتەوە شوێنی خۆی، هەر وامانکرد، بەڵام شەپۆلەکان هێندەی تر بەهێز و گەورەتر دەبوون. بێخاڵی دایکی سافۆ وەك ئەوەی زانیبێتی چی ڕوودەدات، سەیرێکی ناو دەریای کرد و بەدەم گریانەوە گوتی هەموومان دەمرین، ئای لەو شەوە سەختە خۆ بەلەمێك لەو دەریایەدا نیە جگە لە ئێمە. رووی کردە من و گوتی توخوا تۆ مەلە دەزانی ئاگات لە سافۆ بێت، سافۆ تۆی زۆر خۆشدەوێ، ئەو قسانەی بێخاڵ زۆر نیگەرانی کردم و نازاریدام، رووم کردە دەریا و هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی، بیرمکردەوە ئاخۆ ئەمشەو چارەنووسمان چی دەبێت و چۆن دەتوانین خۆمان لە مەرگ ڕزگار

بکەین٠! دوای چەند خولەکێك، شەپۆلێکی گەورە دیسان بەلەمەکەی هەژاندەوە و ئەوجارەش رزگارمان بوو٠ بەلەمەوان بەوپەڕی بڕوابوون بەخۆی و بەلەمەکەی گوتی تکاتان لێدەکەم خۆتان مەترسێنن و چیتر مەشڵەژێن دڵنیابن هیچ روونادات٠ چەند خولەکێك بەلەم لە نێو ئەو شەپۆلە بەهێزانە لە سەماکردن بەردەوام بوو، خەریك بوو ئێمەش بڕوامان بەوە بێت کە هیچمان لێ بەسەر نایەت و ئەو هەموو بەرز و نزمییەی بەلەم کارێکی سروشتییە، بۆیە گورجوگۆڵتر تینمان دایەوە بەرخۆمان و هەوڵێکی تریشماندا و ئاوێکی زۆرمان لە نێو بەلەمەکە فڕێدایەوە نێو دەریا٠ بڕواشمان وابوو لە شەپۆلی زۆر گەورە رزگارمان بووە و زەحمەتە شەپۆلی لەوەش گەورەتر هەبێت تا مەترسی زیاترمان بخاتە سەر، بەڵام ئەو بڕوابوونەمان لەجێی خۆیدا نەبوو و چەند خولەکێکی برد شەپۆلێکی زۆر گەورە لێیدایەوە و ئەوجارە بەلەم نەیتوانی لەبەرامبەریدا بوەستێ و بەتەواوی خستییە سەرلا و هەموومان لەماوەیەکی زۆر کورت رژاینە نێو دەریا و وردە وردە بەلەم بەبەر چاومانەوە نقوم دەبوو٠ هەندێك دەستیان بە بەلەمەکەوە گرتبوو تا بەتەواوی ژێر ئاو کەوت دەستیان لێ بەرنەدا٠ ساتە تراژیدییەکە لەوێوە دەستی پێکرد، لەو کاتەدا هاوار هاواری دایك و باوك بۆ منداڵەکەنیان و کوڕ و کچ بۆ دایك و باوك بەرز بۆوە، کەس نەبوو هاواری فریاکەوتن نەکات٠ ئەو هاوار هاوارە لە لوتکەی بێ هیواییەوە دەهاتە دەرێ، بە قوڕگی

پڕ لە گریان و نا ئومێدییەکی زۆر پڕ بە دەممان هاوارمان دەکرد، بەڵام ئەوەشمان دەزانی لەو نیوە شەوەدا نە کەس فریامان دەکەوێ و نە کەسیش گوێی لە دەنگمان دەبێت، بەڵام دەمانزانی رۆح شیرینە و هەموومان لە پەلەقاژێی مەرگداین. نەهامەتییەکە لەوەدابوو هیچ کامێکمان نە چوپێك و نە هێلەگێکی رزگاربوونمان پێ نەبوو، ئاخر کەسمان لە وڵاتی خۆمان نە بەلەم و نە چوپ و هێلەگ و نە نقومبوونی بەلەممان نەبینیبوو. سامناکی ئەو ساتە زۆر بێ وێنە بوو. بەلەم بەتەواوی لەچاوان ون بوو و دیار نەما، منداڵەکان جگە لە عەللاوی، هیچیان دەنگیان لێوە نەهات و ئەوان لەگەڵ بەلەمەکە ژێر ئاو کەوتبوون، تەنها عەللاوی مابوو، نەختێك مەلەی دەزانی پڕ بەدەمی هاواری دایك و باوك و خوشك و براکانی دەکرد، بەڵام کەس نەبوو وەڵامی بداتەوە. ورده ورده دەنگەکان کەم دەبوونەوە. ئەبو عەلی دوای نقومبوونی بەلەم چەند جارێك دەنگی هات،بەڵام هەر زوو دەنگی نەما. لەپڕ لە نزیکی منەوە نیاز هەولێری سەری لەژێر ئاوەکە دەرهێنا و بەدەنگێکی زۆر خەمناك و پڕ لە تورەیی بانگی سافۆی کچە نازدارەکەی دەکرد و قورگی پڕ گریان بوو، ئەو دەیزانی کچەکەی لەگەڵ بەلەمەکەدا ژێر ئاو کەوتووە، بەدوای بەلەمەکەدا دەگەڕا تا سافۆ رزگار بکات، بەڵام دواجار گوێم لە دەنگی نیازبوو و هەناسە ساردانە هاواریکرد (سافۆ) و سافۆش وڵامی نەدایەوە و ئیتر ئەو بەرەو قوڵایی دەریا رۆیشتبوو و ئیدی نیازیش دەنگی

نەما٠ هەر زوو دەنگی ژنەکان نەما، من لەوە تێگەیشتم خۆ ئەگەر ژنەکان بەرگەی شەپۆلەکانی دەریاش بگرن کوا بەرگەی مەرگی جگەر گۆشەکانیان دەگرن؟! چەند خولەکێکیش دەنگی پیاوەکانی تر هات٠ ئەوەی ئێستاش جێی سەرسامی منە عقید فارس دزەییە، ئەو مەلەوانێکی زۆر باش بوو، بەلاّم نە گوێم لە دەنگی بوو و نە بەرچاویشم کەوت، ئەو خۆی و خێزان و منداڵەکانی هەر زوو دیار نەمان٠ ئیتر دەنگی زۆرێکیان نەماو نقوم بوون٠ شەو هێندە تاریك بوو لە دووری یەك مەتردا کەس یەکتری نەدەبینی، ئاوی سوێریش کەبەرچاومان کەوتبوو هێندەی تر کوێری کردبووین، لەگەڵ ئەوەشدا سوتەمەنی بەلەمەکە بەسەرماندا رژابوو یان تێکەڵی ئاوی ئەو شوێنە بوو بوو ئەویش هێندەی تر بینینی لاواز کردبووین، بۆیە تەنها بەهۆی دەنگ دەمانزانی کێ ماوە و کێ بێسەر و شوێنە٠ بەبێ هیوایی و بۆ ئەوەی چەند خولەکێك زیاتر بژین سەرەتا بە دەوری خۆماندا دەخولاینەوە و بانگی یەکتریمان دەکرد، زۆر کەم مابوینەوە و وەلاّمی یەکترمان دەدایەوە، ناوە ناوە بانگی عەللاویمان دەکرد و وەلاّمی دەداینەوە، بەلاّم ئەویش تاقەتی نەهێنا و دوای ماوەیەك چەند بانگمانکرد وەلاّمی نەداینەوە، پێدەچوو ئیتر ئەویش بەرگەی مەرگی دایك و باوك و خوشك و براکانی نەگرتبێت و بڕیاریدابێت خۆی رادەستی دەریای مەرگهێن بکات و بچێتە لای دایك و باوك و خوشك و براکانی٠ وردە وردە دەنگەکان کەم

بوونـەوە، دوای ماوەیـەك ملـی رێمـان گـرت، بـەڵام نەمانـدەزانـی بۆكوێ دەچیـن، رەنگـە كاتێكـی بـاش هـەر لـەو شـوێنە بـەدەوری خۆمانـدا سوڕابینەوە و نەمانزانیبێـت، لـەو كاتـەدا بیـرم لـە دەربازبـوون لـەو مەرگەسـاتە نەدەكـردەوە، بیـرم لای دوا قسـەكانی بێخـاڵ بـوو، ئـەو سـافۆی بەمـن سـپارد بـوو، بـەڵام نەمتوانـی سـافۆ لـە مـەرگ رزگار بكـەم، هەرچیـم دەكـرد نـە هیچـم دەبینـی و نـە دەمتوانـی بیـر لـە شتێك بكەمـەوە، بیـری مـن لـە نێـو بەلەمەكـەدا بـوو، ئـەو ساتانەم دەهاتـەوە پێـش چـاو، كـە چـۆن هەمـوومـان ترسـی ئـەو رووداوەمـان لـێ نیشـتبوو، وەك ئـەوەی سـیناریۆی رووداوەكەمـان خوێندبێتـەوە و دەمانزانـی لـە كۆتایـی رێگاكـەش بێـت هـەر نقـوم دەبیـن. نەختێـك لـەو شـوێنە دوور كەوتینـەوە، دڵنیابـووم، كـە هیـچ كام لـە منداڵەكان و خێزانـەكان نەمـاون، خەیاڵـم لای دایكـم بـوو، خەیاڵـم لای ئـەو رۆژانـە بـوو، كـە لەسـەر زەوی بـووم، خۆزگـەم بـە رۆژە ناخۆشـەكانی ژیانـم دەخواسـت، بەبـەر خۆمـەوە دەمـوت هەڵەتكـرد، بڕیارەكـەت دروسـت نەبـوو، كـە بیریشـم دەچـووە سـەر شـەڕەكانی كەپكـی حەمەد ئاغـا و بێسـتانە و بەنـی هەریـر، شـەڕە سـەخت و خوێناوییەكانـی مامـەڕوت و كارۆخ و رووەڵـە و كەڵەكـێ باڵەییـان، دەمگـوت مـردن هـەر مردنـە، ئینجـا چـۆن و لـە كـوێ بێـت. بیـرم دەچـووە سـەر ژیانـی ئاوارەیـی خۆمـان، مـن هـەروا ژیـاوم، دایكـم زوو زوو دەیگـوت: بـرا گەورەكـەت لـە ئـۆردوگای بەهرامـی پارێـزگای لوڕسـتان لـە رۆژئـاوای ئێـران لەدایـك بـووە و تـۆش لەكاتـی دوور خسـتنەوەی خێزانەكەمـان

لەژێر چادرەکان، لە قەزای مەحمودییەی سەر بە بەغدا لەدایك بوویت، لەوەتای فامم کردۆتەوە بیرم نایە چەند ساڵێك لە شوێنێك ژیابین، بەهۆی پێشمەرگایەتی باوکم هەر ماوەیەك و لە شوێنێك دەژیاین. لەچەند خولەکێکدا تێکڕای ژیانم هاتەوە بەرچاو بە رۆژە خۆش و ناخۆشەکانیەوە، بیرم لە قسە و ئامۆژگاری ئەو کەسانە دەکردەوە، کە پێیان دەوتم وریابە ڕێگەی دەریا مەترسیدارە. لەخۆمم دەپرسی باشە من بۆ بەقسەی باوکمم نەکرد، کە پێیوتم کاتی سەفەر نییە و پەلە مەکە، من بۆ فرمێسکەکانی دایکمم نەخوێندەوە، ئەی بۆ گوێم لە ئامۆژگارییەکانی باپیرم نەگرت، خۆ ئەگەر بەقسەی ئەوانم بکردایە ئیستا لەنێو شەپۆلە بێ بەزەییەکانی دەریای ئیجە چاوەڕوانی مەرگ نەدەبووم، ئێستا چاوەڕێی نقوومبوونم نەدەکرد؟!.

هێزم هێنایەوە بەرخۆم و بڕیارمدا لە هەوڵدان بەردەوام بم، ئەگەرچی پێموانەبوو سەرکەوتوو بم، بەڵام لەبەرخۆمەوە دەموت نابێ وا بەئاسانی خۆت رادەستی مەرگ بکەیت، خودا هاوکارت دەبێ، دیسانەوە خەیاڵم دەچۆوە لای هاوڕێ بێسەر و شوێنەکانم، دەنگی نیاز لە گوێمدا دەزرینگایەوە، هەستم دەکرد نیاز هێشتا بەدوای سافۆدا دەگەڕێت و نایدۆزێتەوە، ئەوەش بڕستی لێ دەبڕیم و چەند جارێك نقووم دەبووم و دەهاتمەوە سەر ئاو. درێژەمدا بە خۆڕاگری و جوڵەکردن بەسەر ئاوەوە سودم لە شەپۆلە بێ بەزەییەکان وەرگرت، وردە وردە دەستم کرد بە

ڕۆیشتن بەرەو کەناری ئاوەکە، نەمدەزانی ئەو ئاراستەیەی بۆی دەچم دروستە یان نا، بەڵام هەر بەردەوام بووم، کەسمان ئومێدی ڕزگاربوونمان نەبوو، هەمووومان چاوەڕوانی بەهاناوە هاتن بووین، هێندەمان هاوار کردبوو بۆ بەهاناوە هاتنمان، دەنگمان نووسابوو، کەس دەنگی نەمابوو، لەو نێو دەریایە جگە لە بیستنی دەنگی شەپۆلە تورەکان هیچ دەنگێکی تر نەدەهات. قسەکانی بێخاڵم بیردەکەوتەوە بە پاڕانەوە و بەدەم گریان دەیگوت هەموومان دەمرین ، خۆ بەلەمێك لەنێو ئەو دەریایەدا نیە جگە لە ئێمە، هەرواببوو جگە لە ئێمە هیچ بەلەمێکی ترم نەبینی. هەر یەکێکمان بڕوامان وابوو، کە تەنها خۆی ماوە، بەهۆی شەپۆلەکان لێك دوور کەوتبوینەوە و دەنگیشمان هێندە لاواز بووبوو بڕواناکەم دوو مەتر ڕۆیشتبێت. ئیلاهی ئەوشەوە بۆ هێندە دوور و درێژبوو و نەدەبڕایەوە!! شەوێکی هاوین کوا هێندە دوور و درێژە، بۆهێندە شەوێکی تاقەت پڕوکێنە و نەبڕاومیە؟! خەفەتی لەدەستدانی ئەو هەموو هاوڕێیەم بارێکی قورسی خستبۆ سەرشانم، ڕەنگە ئەو هەموو نوقوومبوونە هی ئەو بارە قورسە بێت، ئەو بێ هێزییەم هی دەنگی نیاز بێت و ئەو فرمێسك ڕشتن و گریانەشم بۆ سافۆ بوبێت و نا ئومێدییەکەشم لە بێخاڵەوە بۆ مابێتەوە، ئاخر دوو شەو بەر لە ئێستا باسی جوانی و پاکی دەریام بۆ سافۆ دەکرد، سافۆ عاشقی ماسی بوو، دەمگوت سافۆ گیان تۆ چەند ماسیت خۆش دەوێت، ماسیەکانیش هێندە تۆ و دەریایان خۆش دەوێت،

ئێستا دڵنیام ئەو دەریا پاکەی بۆ سافۆ وێنام کردبوو رۆحی پەپولە ئاسای کێشاوە، رەنگە جەستە ناسك و جوانەکەشی بکاتە خۆراکی ئەو ماسییانەی سافۆ خەیاڵی لایان بوو، خودایە دەریا بۆ هێندە بێ بەزەییە بەرامبەر رۆحی پاکی سافۆ!! من ئەو شەوە، کە چاوەڕوانی مەرگ بووم، کردبومە یادی ئازیزانم، خەیاڵم لەیەك کاتدا دەچۆ حزوری هەموویان، هەوڵمدەدا لە خەو خەبەریان بکەمەوە و ماڵئاواییان لێ بکەم، یەکە بەیەکە پێم دەگوتن لەگەڵ سافۆ بەرەو سەفەرێکی ئەبەدی دەچین، دەمویست پێیان بڵێم سافۆ نەگەیشتە ئەکواریۆمە دەستکردە رەنگاو رەنگەکانی ئەوروپا و بەڵێنەکەشی نەگەیاندە سەر، کە من و باوکی سواری گەورەترین چەرخوفەلەك بکات· هێندە بێهێز بووم هەستم دەکرد خەریکە توانای بیرکردنەوەش بەتەواوی لەدەستدەدەم، ئەوە چەند کاتژمێرە من لەنێو قولایی دڕندەترین دەریادام، کە روحی هاوڕێکانمی زۆر بێ بەزەییانە لەبەر چاوم کێشا، وام هەستدەکرد سافۆ هێشتا لێمەوە نزیکە، هەوڵم دەدا دەستم پێی بگات و بیهێنمەوە سەر ئاو و توند لە باوەشی بگرم، بەبەر خۆمەوە قسەم بۆ دەکرد، چیرۆکی ماسییە رەنگاو رەنگەکانم بۆ دەگێڕایەوە، ئەو بێدەنگ بوو، لای من وابوو بێدەنگییەکەی هی قوڵبوونەوەیە لە ناوەرۆکی چیرۆکەکە، ئەو هێشتا لە لەخەیاڵیدا وێنەی ماسییەکان دەکێشێت و دەست بە پشتیاندا دەهێنێ، بیرم لە بێخاڵ دەکردەوە، چۆن بێخاڵ نابێت بە پەری دەریا و سافۆ رزگار بکات! هەموو ژیانی

بێخاڵ سافۆ بوو، ئەو لە پێناو دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ سافۆ خۆی خستە قولایی دەریای ئیجە، ئەی چۆن رۆحە پاکەکەی نابێتە پەری دەریا و سافۆ رزگار ناکات!

لەنێو شەپۆلەکاندا مامەوە و بە هیلاکییەوە جار جارە چەند هەنگاوێک دەرۆیشتم، وردە وردە بینایی بۆ چاوەکانم دەهاتەوە، هەستم دەکرد ئەو شوێنەی شەپۆلەکان ئاراستەی کردووم لە هەموو شوێنەکانی تری دەوروبەرم تاریکترە، بە بڕوای خۆم من بەرەو کەنارێک دەڕۆم کە شاخێکە، هەروا دەرچوو. دوای روناکبوونەوەی دونیا و خۆر هەڵاتن گەیشتمە نزیک شاخەکە، لەوێ زەحمەتییەکی زۆرم بینی، ماوەیەکی دوور و درێژ نەمتوانی چەند مەترێک ببڕم، چونکە شەپۆلەکان بەهەموو هێزی خۆیان لە شاخەکەیان دەدا و دەگەڕانەوە و منیشیان دوور دەخستەوە، ئەوەش وایکردبوو، کە نەتوانم بە ئاسانی خۆم بگەیەنمە شاخەکە و هۆکارێکی تریش ئەوە بوو، کە هێز و توانای مەلەکردنم نەمابوو، بەڵام لەبەر خۆمەوە هەر دەمگوت دەبێ ئەو رێگا کورتەش ببڕیت و خۆت بگەیەنیتە کەنار. دوای هەوڵێکی زۆر خۆم گەیاندە شاخەکە و چوومە نێو درزێکی شاخەکەوە و راکشام، ئێستاش لەوە تێنەگەیشتم کە خەوم لێکەوتووە یان لەهۆش خۆم چووم، چونکە هیچ شتێکم لەو خەوە بیر نایەت، نازانم بەڕاستی لە خەوێکی قوڵدابووم یان هۆشم لەدەستداوە. تا دەوری نیوەڕۆ بە ئازاری پشت و رانەکانم خەبەرم بۆوە هەستمکرد پشتم

برینـداره، هـەر واشـبوو، ئـەو شـوێنەی مـن لێـی راکشابووم بەهـۆی شـەپۆلەکانی ئـاوەوە بزمـاری بەردینـی دروسـتکردبوو، بزمـارەکان چووبـوون بەهەمـوو پشـتم و رانمـدا، دوای لەخـەو هەسـتانم هەسـتم بـە تینویەتـی زۆر دەکـرد، بـەڵام ئـاوی دەریـا هێنـدە سـوێر بـوو کـە بەهیـچ شـێوەیەك بـۆ خواردنـەوە نەدەبـوو، سـەیرێکی نێـو دەریـام کـرد و بینیـم یەکێـك زۆر نزیـك بۆتـەوە لـە کەنـار و پێدەچـوو تووشـی هەمـان کێشـەی مـن بوبێـت و نەتوانێـت زیاتـر بـڕوات بەهـۆی ئـەو شـەپۆلانەی لـە شـاخەکەی دەدا و دەگەڕایـەوە، ویسـتم بچـم یارمەتـی بـدەم و چومـەوە نێـو ئاوەکـە تـا بزانـم ئـەو کەسـە مـاوە یان نـا، ئـەو ڕێڕەوەکـەی گـۆڕی، چەنـد مەترێـك لەخـوار شـوێنەکەی مـن کەنارێکـی پـان و بەرینـی بینـی و وای بەبـاش زانـی بـەرەو ئـەوێ بـڕوات و سـەرکەوتوو بـوو لـەو بڕیـارە، ئـەو بـەرەو ئـەوێ چـوو و منیش بـەرەو هەمـان ئاراسـتە چـووم٠ کـە خـۆم خسـتەوە نێـو ئاوەکـە هـەر ئەوەنـدە مابـوو رۆحـم دەرچێـت لەتـاو ئـازاری برینەکانـی کەوتبونـە جەسـتەم، چونکـە ئاوەکـە سـوێر بـوو و بـەر برینەکانـم دەکـەوت ئازارێکـی ئێجـگار زۆرم بینـی، جگـە لـەوەش هەسـتم بـە هیلاکییەکـی زۆر دەکـرد و وەك ئـەوەی لـە سـەربانێك کەوتبێتمـە خـوارەوە و هەمـوو گیانـم تێـك شـکابێت، ئاخـر حـەوت کاتژمێـر مانـەوە لەنێـو دەریـا و بـەو هەمـوو خـەم و خەفەتەشـەوە هـەروا ئاسـان نیـە٠ هـەر چۆنێـك بێـت چومـەوە نێـو ئاوەکـە و بـە ئاراسـتەی ئـەو هاوڕێیەمـدا رۆیشـتم، خۆشـبەختانە ئـەو کەسـەش رزگاری بـوو و

خۆی گەیانـدە سـەر تاشـە بەردێکـی گـەورە، بـەڵام هیـچ هێزێکـی تێدانەمابـوو، خـۆم گەیانـدە لای ئـەو و لـە سـەر تاشـەبەردێکی پـان ڕاکشـاین، مـن هەمـوو گیانـم دەکزایـەوە. ئـەو (کریڤـۆ بەهـزاد)ی هاوڕێـم بـوو، زۆر بەلامـەوە سـەیر بـوو کـە ڕزگاری بـووە، چونکـە کریڤـۆ ڕۆژی پێشـتر کـە ئێمـە مەلەمـان دەکـرد ئـەو نەهاتـە نێـو ئاوەکـە دەیگـوت مەلـە نازانـم، کریڤـۆ پشـوێکیدا و داوای ئـاوی کـرد، بـەڵام جگـە لـە ئـاوی سوێر هیچی تری لێنەبوو، بەیەکەوە دانیشـتین و بەدیـار شـەپۆلە بـێ ڕەحمەکانـی دەریـاوە لـە چاومڕوانـی هاوڕێکانماندابوویـن، نەمـن و نـە ئەویـش توانـای قسـەکردنمان نەبوو، کەسـمان بڕوامـان وانەبـوو یەکێکـی تـر لـە هاوڕێکانمـان ڕزگاری بوبێـت، هـەم هیـلاك و شـەکەت هـەم تووشـی شـۆکێکی زۆر خـراپ بوبویـن. بۆماوەیەکی دوور و درێـژ بەدیـار شـەپۆلەکانەوە بەبێدەنگی فرمێسـکمان ڕشـت، دواتـر کەوتینـە پرسـیاری سـاتی ژێرئـاو کەوتنـی بەلەمەکەمـان، دیـار بـوو کریڤـۆش هەمـان خـەم و هەمـان هـاواری نیـاز بـۆ (سـاڤۆ) بڕسـتی لەویـش بڕیبـوو و بۆتـە داخێکـی گـەورە بـۆی. سـاڤۆ هـەر خۆشەویسـتی مـن نەبـوو، ئـەو کچـە خنجیلـە ڕوح سـوکە بـوو، کـە چەنـد ڕۆژێـك هەموومانـی سـەرقاڵکردبوو بەخۆیەوە، مەجلیسـی سـاڤۆ لـە مەجلیسـی هەمـوان قەرەباڵختـر و خۆشـتر بـوو، ئـەو تەمەنێکـی زۆر کەمـی هەبـوو و هیـوا و ئاواتـی ئـەوە بـوو بگاتـە وڵاتێـك و ئـەو ئێمـە بباتـە شـاری یـاری، هەمیشـە دەیگـوت دەتانبـەم بـۆ شـاری یـاری، تـۆ و باوکـم سـواری چـەرخ و فەلەکـی گـەورە دەکـەم

و ئەویتر سواری ئۆتۆمبێل وئەوانی تریش سواری ئەسپ و شەمەندەفەر دەکەم. لەگەڵ کریفۆ ماوەیەك بە بێدەنگی دانیشتین و فرمێسکەکانمان تێکەڵ بەو دەریایە دەکرد، کە رۆحی هاوڕێکانمانی کێشا، یادگارییە شیرینەکانی چەند کاتژمێرێك لەمەوبەری سافۆمان بیر یەکتری دەهێنایەوە. سافۆ بۆتە برینێکی قوڵ لەنێو دڵی ئێمە، خەمی لەدەستدان و بێسەروشوێن بوونی هاوڕێیانی ترمان بەتەواوی سەری لێ شێواندبووین، نەماندەزانی دەبێ چی بکەین و چۆن هەڵسوکەوت بکەین، هێشتا بیرمان لەوە نەدەکردەوە ئاخۆ ئێمە رزگاربووین یان نا، هێندە بێتاقەت بووین نەماندەتوانی بڕیار بدەین، نەماندەتوانی رێگە چارەیەك دەستنیشان بکەین، خۆ بەبێ جلوبەرگ و بەو تینویەتییە لە کەناری ئەو دەریا سوێرە بێ بەزەییە دانانیشین، دڵنیابووین کە هێشتا مەترسی لەسەر ژیانمان هەیە و رەنگە لە تینویەتی و برسییەتی بخنکێین و گیان لەدەست بدەین. سەیرێکی دەوروبەری خۆمانکرد، هەموو لایەکمان دەریابوو و لایەکیشمان شاخێکی بەرز، هێشتا نازانین ئەو شوێنەی ئێمەی لێین خاکی یۆنانە یان تورکیا، چارەیەکمان نەبوو جگە لە هەڵگەڕان بەشاخەکەدا بەو هیوایەی بگەینە ئاوەدانییەك، بۆیە بڕیارماندا بەشاخەکەدا سەرکەوین. لەگەڵ کریفۆی هاوڕێم بەبێ جل و بەرگی و بە پێی پەتی بە چاوی پڕ فرمێسك و جەستەیەکی شەکەت بەنێو دار و دەوەنی شاخەکەدا کەوتینە رێ و نەماندەزانی ئەو رێگەیە بەرەو کوێمان دەبات. وردە وردە

سەردەکەوتین، ناوە ناوەش لەیەکتریمان دەپرسی تۆ بڵێی لە دوێنێ شەوەوە ئێمە توشی ئەو رووداوە بووین کەس پێی نەزانیبێت؟ هیچ راست نییە ئەگەر هەواڵی ئەو مەرگەساتە نەزانرابێت، خۆ دەبێت قاچاغچییەکان بزانن توشی کێشەیەك هاتووین، چونکە هەواڵی گەیشتنمان پێنەداون. هەر خۆشمان دەمانگوت ئاخر لەو دەریا گەورە بێ بنەدا، بەلەمێکی دوانزە مەتری ژێرئاو کەوتووە ئاساییە ئەگەر کەس نەیزانیبێت و ئاشکرا نەبوبێت. لە راستیدا بیرکردنەوەکەشمان لەجێی خۆیدابوو، چونکە ئەو شوێنە رێگایەکی سەرەکی بوو لە نێوان وڵاتانی (ئیتاڵیا، یۆنان و تورکیا). هەر بۆیە سەرلەبەیانییەکەی بەلەمێکی گەورەی وڵاتی ئیتاڵیا بەو شوێنەدا دەڕوات کە روداوەکەی لێبووە، چەند تەرمێك لە نزیك شوێنی رووداوەکەدا دەبینێ بەسەر ئاوەکەوە، بەپەلە پەیوەندی دەکەن بە پۆلیسی تورکیا و پێیان دەڵێن چەند تەرمێکمان لەو ناوەدا بینیوە، بەڵام دەوڵەتی تورکیا دوای نیوەڕۆ کەشتییەکی فریاکەوتن و چەند بەلەمێك و چەند هێلیکۆپتەرێکیان ناردە ئەو شوێنە. ئێمە لەسەر شاخەکەوە سەیری دەریامان دەکرد، کەشتییەکی گەورە و چەند بەلەمێکمان زۆر لەدوور و لە قوڵایی دەریا بینی، هەرچەند دڵنیا نەبووین، کە بە رووداوەکە زانرابێت و بۆ بەهاناوە هاتنی ئێمە هاتبن، بەڵام کە بەلەمەکانمان بینی لەگەڵ کریفۆ بڕیارماندا لە شاخەکە بێینە خوار و بچینەوە کەنار دەریا بۆ ئەوەی ئەگەر بۆ فریاکەوتنی ئێمە هاتبن ئێمەش

بدۆزنـەوە و رزگارمـان بکـەن، چونکـە دڵنیـا نەبووین و نەماندەزانـی ئـەو ڕێگەیـەی ئێمـە گرتومانەتـە بـەر بـەرەو کـوێ دەچـێ٠ بـە ڕاکـردن خۆمـان گەیانـدەوە لێـواری ئاوەکـە و دەسـتمانکرد بـە هێماکـردن تـا بەلەمێکـی ماسـیگر ئێمـەی بینـی و هـات بۆلامـان و سـەری خسـتین، بەلەمـەوان پیاوێکـی سـەر و ریـش سـپی قەڵـەوی تـورك بـوو، پیاوێکـی میهرەبـان دیـار بـوو، کـە ئێمـەی بینـی فرمێسك بەچاوانیـدا هاتـە خـوارەوە، وتـی بـۆ خۆتـان داوەتـە دەسـت ئـەو قاچاخچییـە بـێ ویژدانانـە؟ پێش ئێـوە دوو تەرمـم هەڵگرتۆتـەوە و رادەسـتی پۆلیسـم کـردوون٠ ئێمـە قوڕگمـان وشـك ببـو و توشـی شـۆکێکی گـەورەش هاتبوویـن نەمانتوانـی هیـچ گفتوگۆیـەك لەگـەڵ بەلەمـەوان بکەیـن، داوای ئاومـان لـە بەلەمـەوان کـرد، ئـەو وتـی ناتوانـم ئاوتـان پـێ بـدەم، پێویسـتە خۆتـان بگـرن تـا دەگەینـە ئـەو کەشـتییەی، کـە پزیشـك و پەرسـتاری تێدایـە و بـە هانـای ئێـوەوە هاتـوون٠ ئـەو دەترسـا و نەیدەزانـی چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ ئێمـەدا بـکات، چونکـە پێیوابـوو نابـێ بەبـێ ڕێنمایی پزیشـك ئـاو بخۆینـەوە، نەختێـك میـوەی پێدایـن و قوڕگمـان تەڕبـۆوە بـەو میوەیـە٠ دوای چەنـد خولەکێـك گەیشـتینە ئـەو کەشـتییە گەورەیـە و چەنـد پۆلیسـێك یارمەتیاندایـن تـا لەکەشـتییەکە سـەرکەوتین، پزیشـکەکان چەنـد قومێـك ئاویـان پێدایـن٠ بینیمـان هـەردوو هاوڕێمـان سـامان رەئـوف و عوسـمان سـعاتچی رزگاریـان بـووە و لەنێـو کەشـتییەکەدان، پۆلیسـەکان ڕێگەیـان پێنەدایـن قسـە لەگـەڵ یەکتـری بکەیـن و بـێ

وەستان کەوتنە پرسیارکردن لەمن و کریڤۆ، پرسیارەکانیان زیاتر لەبارەی قاچاغچییەکان و ژمارەی سەرنشینانی بەلەمە نقووم بووەکەی ئێمە بوو بۆئەوەی بە وردی بەدوای زیندووەکاندا بگەڕێن. کریڤۆ لەوکاتەدا وتی من ژمارەی ئۆتۆمبێلی قاچاغچییەکەم لەبەر کردووە، ژمارەکەمان پێدان و کەشتییەکە بەرەو شوێنی رووداوەکە دەڕۆیشت، لەو کاتەدا بە قوڵپی گریان لەگەڵ هاوڕێیان کەوتینە گفتوگۆ، هەر شتێکمان لەیەکتری دەپرسی بێ وەڵام بوو، هەمووومان شۆك بووین، کەس بیری نەمابوو یان راستتر بڵێم کەسمان توانای ئەوەمان نەبوو بۆیەکتری باس بکەین چی روویداوە، جگە لە رشتنی فرمێسك. ئێمە لە دیوی دەرەوەی کەشتییەکە دانیشتبووین، کە لەشوێنی رووداوەکە نزیك بووینەوە کەشتییەکە وەستا، لە بەشی پشتەوەی کەشتییەکە بەلەمێکی بچوکیان داگرت، وامانزانی بۆ گەڕان بەدوای هاوڕێکانمان دەیانەوێ بەو بەلەمە بچوکە بگەڕێن، بەڵام کە بینیمان تەرمێکی ئاوساویان خستە نێو بەلەمە بچوکەکە، خێرا بەرەو بەشی پشتەوەی کەشتییەکە چووین تا بزانین ئەو تەرمە کێیە، بەڵام رێگەیان نەدا لێیان نزیکببینەوە، دواتر تەرمەکەیان هێنایە نێو کەشتییەکە و خستیانە کیسەی تایبەت و نەیانهێشت لە نزیکەوە بیبینین. کەشتی کەوتەوە رێ بەرەو شوێنی رووداوەکە، تا گەیشتینە ئەوێ دوو تەرمی تریان بەهەمان رێوشوێن هێنایە نێو کەشتی، وردە وردە کەشتی لە شوێنی رووداوەکە نزیك دەبۆوە، ئێمە نەماندەزانی

شوێنی روداوەکە کوێیە، بەڵام تیمی کەشتییەکە دەیانزانی، ئێمە هەموومان لەچاوڕوانی گەیشتن بە شوێنەکە بووین، تا لەپڕ چاومان چۆ سەر هەندێك جل و بەرگ و جانتای هاوڕێکانمان، کە بەسەر شەپۆلەکانەوە دەهاتن و دەچوون. تێگەیشتین کە لە شوێنی رووداوەکە نزیك بوینەتەوە، هێندەی نەبرد کەشتی وەستا و دوو بەلەمی بچوك و چەند بەلەمێکی ماسیگرەکانیش گەیشتنە شوێنەکە، سەرمان هەڵبڕی دیمەنە تراژیدییە لەبیر نەکراوەکەمان بینی، چەند تەرمێك بەسەر ئاوەوە بوون، هەموویان پشتیان لە ئاسمان و روویان لەدەریا بوو، لەوکاتەدا دیمەنێکی سەرنجڕاکێش و سەیر و سەمەرەمان بینی، دوو کەسی تری هاوڕێمان هێشتا زیندوو بوون و خۆیان بە تەرمەکانەوە گرتبۆوە، هەردووکیان دەرهێنان و دوای چەند خولەکێك هێنانیان بۆ لای ئێمە، چیرۆکی ئەوان زۆر جەرگبڕتربوو، بەڵام لەوکاتەدا تەنانەت توانای قسەکردنیشیان لەدەستدابوو، ئەوان نەیاندەتوانی بە باشی ببینن وەك چۆن ئێمەش وامان لێهاتبوو، زۆر شەکەت و ماندوو بوون، قومێك ئاویان پێدان و لەسەر کورسییەکانیان راکشان. هەریەك لە ئازاد و عەدنان شەو هەر دوای نقومبوونی بەلەمەکە و دوای چەند خولەکێك، کە دەبینن تەرمەکان سەر ئاو کەوتوون خۆیان بە تەرمەکانەوە گرتبۆوە تا کاتی رزگارکردنیان. زۆر هەوڵمان لەگەڵدان بیاندوێنین تا لە دەمی ئەوانیشەوە چیرۆکە پڕ لە مەرگەساتەکە ببیستین، بەڵام بێهودە بوو. ئەوان لە ئێمە هیلاك و شەکەتتر

بـوون، لـه کاتژمێـر ـ دوانـزەی شـەوەوە لەنێـو دەریـا مابوونـەوە تـا کاتژمێـر دووی دوای نیـوەڕۆ، چوارده کاتژمێـر کاتێکـی زۆره، بـەڵام ئـەوەی بـاری دەروونـی ئەوانـی هێنـدەی تـر تێکشـکاندبوو خـۆ گرتنەوەیـان بـوو بەتەرمـی هاوڕێکانمـان، کـه سـەر ئـاو کەوتبـوون، ئـەوان چـوارده کاتژمێـر لەگـەڵ تەرمـی هاوڕێکانمـان لەنێـو شـەپۆلەکاندا مابوونـەوە. تیمـی کەشـتییەکە بەردەوامبـوون لـه دەرهێنانـی تەرمـەکان، تـەواوی ئـەو بەلەمـه بچوکانـه بـه وردی بەونـاوەدا دەگـەڕان، کاتژمێـر بـوو بـه چـواری ئێـواره، دوای ئـەوەی دڵنیابـوون، کـه هیـچ تـەرم یاخـود کەسـێکی زینـدوو نەمـاوه، کەشـتییەکەی ئێمـه کەوتـەرێ بەنێـو قوڵایـی دەریـادا، بـەڵام بەلەمـه بچوکەکان لەو شوێنه مانەوه و سەرقاڵی گەڕانی زیاتر بوون.

دوای زیاتـر لـه کاتژمێرێـك کەشـتییەکه گەیشـته کەناراوێـك لەنێـو شـارێکدا، ئـەو شـوێنەی کەشـتییەکه لێـی وەسـتا قەرەباڵغییێکـی زۆری لێبـوو، دوای چەنـد خولەکێـك داوایـان لێکردیـن، کـه لەکەشـتییەکە دابەزیـن، ئـەو دوو هاوڕێیـەی سـێ کاتژمێـر لەمەوبـەر رزگارکـران نەیانتوانـی بەپێـی خۆیـان بێنـه خـوارێ، بۆیـه بەقەرەوێڵـەی تایبەتـی گواسـتنەوەی نەخـۆش لەلایـەن چەنـد پەرسـتارێکەوە دایانبەزانـدن، هەریەکـه لـه ئێمـەش پەرسـتارێکمان لەگـەڵ بـوو، بـه پێـی پەتـی و بەتەنهـا شـۆرتێکی مەلـه لـه کەشـتییەکه هاتینـه خـوارێ، کـه گەیشـتینه وێسـتگەکه بەدەیـان کەناڵـی تەلەفزیۆنـی لەمبـەر و ئەوبـەری رێگاکـه وەسـتابوون، زوومـی هەمـوو کامێـراکان لەسـەر

ئێمە بوو، ئێمە بە چاوی پڕ فرمێسك و دڵێکی پڕ لە غەم و پەژارە هەنگاوەکانمان هەڵدەهێنا، یەکە یەکە پەیامنێرەکان مایکی کەناڵەکانیان دەهێنایە بەردەممان و لەگەڵ وتنی (گیچمیش ئۆڵسون) واتا هەمیشە لە ڕزگاربووندا بیت! پرسیاری چۆنییەتی ڕووداوەکەیان دەکرد، ئێمە کەسمان توانای وەڵامی پەیامنێرەکانمان نەبوو، ئاخر چۆن مرۆڤ ئەو توانایەی هەیە بتوانێ لەسەر ڕووداوێك قسە بکات، کە چەندین تەرمی هاوڕێیانمان لەگەڵدایە و نەیانتوانی وەك ئێمە گیانی خۆیان رزگار بکەن. دیمەنەکان تاڵ و پڕ ئازار بوون، بۆ ئێمە کە لەوڵاتێکی غەریبداین، تێپەڕاندنی ئەو کارەساتە گەورەیە ئاسان نیە، ئێمە نەماندەزانی لەکوێین، نازانین چیمان بەسەردێ، جەستەیەکی شەکەت و روحێکی پڕ ئازار، ئازارێك بۆ مەرگی هاوڕێیان، بۆمەرگی سافۆ و منداڵانی تری ڕووداوەکە، زرینگانەوەی دەنگی پڕ لە حەسرەتی نیاز بۆ سافۆ هەموو خولەکێك گڕی بەردەدایە ناخمان. بەدرێژایی چەند سەد مەترێك ڕۆژنامەنووسان وەستابوون، ئێمەیان بەرەو ئەو ئامبولانسانە دەبرد، کە وادیار بوو بۆ ئێمەیان هێنابوون، من و کریڤۆ لە یەکێك لە ئامبولانسەکان سەرکەوتین و بە خێرایی بەرەو نەخۆشخانە کەوتینە ڕێ و دوای چەند خولەکێك گەیشتینە نەخۆشخانە، سەیری تابلۆی سەر دەرگای نەخۆشخانەکەم کرد لێی نووسرابوو (چەشمە هەستانەسی) نەخۆشخانەی چەشمە، تێگەیشتم کە ئێمە هێنراوین بۆ شارۆچکەیەك بە ناوی (چەشمە)، تا ئەوکاتە

نە کەس پێی گوتبووین لەکوێین و نە کەسیشمان دەمانزانی لە کوێین؟ لە نەخۆشخانەکە بەوپەڕی ڕێزەوە پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین و بەرەو نهۆمی سەرەوەی نەخۆشخانەکە ڕێنوێنیان کردین، هەر سێ کەس و خراینە ژوورێك، من و کریڤۆ و عوسمان خراینە ژوورێکەوە، خێرا دەستکرا بە پشکنینە پزیشکییەکان، بۆ هەریەکە و دەبەیەك دەرمانی تایبەتمان پێدرا، کە بچینە حەمام و خۆمانی پێ بشۆین، چونکە پێیان وابوو کە ئاوی سوێری دەریا و ئەو سوتەمەنییەی بەرمان کەوتبوو کاریگەری کردۆتە سەر جەستەمان، جل و خاولی تایبەتیان پێداین و دوای چەند خولەکێك لە خۆشوشتن دەرمانی تایبەتمان پێدرا، هێندە دڵپڕ و غەمبار بووین هیچ دڵدانەوە و لەباوەشگرتنێك لەو ئازارە قورسانەی کەم نەدەکردینەوە، دکتۆرەکانیش لەوە تێگەیشتبوون کە جگە لەوەی باری تەندروستی جەستەییمان خراپە، ئەوا باری دەرونیشمان زۆر وێران و نا هەموارە، بۆیە پێدەچوو ئەو دەرمانانەی پێیانداین ئارام بەخش و خەوهێنەر بێت، ئاخر ئەگەر دەرمانەکان خەوهێنەر نەبێت چۆن دەکرێ لە بارودۆخێکی وادا مرۆڤ هەر لە ئێوارەوە بخەوێ تا ڕۆژی دواتر؟! ڕۆژی دواتر لە خەو هەڵساین و دیسان دەستکرایەوە بە پشکنینی پزیشکی، خواردنمان پێدرا، بەڵام کەس نەیتوانی دەست بۆ خواردنەکە بەرێت و بیخوات. دەمەو نیوەڕۆ چەندین کەس لە بەرپرسانی ئەو شارە هاتنە لامان، قائیمقامی شارەکە و سەرۆکی شارەوانی و بەڕێوەبەری پۆلیس و بەڕێوەبەری

نەخۆشخانە هاتن بۆلامان، دەستیانکرد بە دڵدانەوەمان، پەرۆشی زۆریان بۆ دەربڕین و هاوخەمیشیان نیشاندا بۆ گیان لەدەستدانی هاوڕێیانمان. دەرگای سەردانی خەڵك کرایەوە بۆلای ئێمە، ئەو ڕۆژە تا درەنگانی شەو خەڵکێکی ئێجگار زۆر هاتنە سەردانمان، ئێمە هیچکام لەوانەمان نەدەناسی، درەنگانی شەو پەرستارێکی کچ هاتە لامان، بە کرمانجی دەستی کرد بە پرسیارکردن، لە نێو هەموویان تەنها من کرمانجییەکی باشم دەزانی، دیار بوو پەرستارەکە خەڵکی شاری (ماردین)ی باکوری کوردستان بوو و ناوی (ئیلهام) بوو، زۆر دڵتەنگی خۆی نیشاندا و دەستی کرد بە دڵدانەوەی ئێمە، هەرکاتێك دەهاتە لامان، کە فرمێسکەکانی ئێمەی دەبینی وەك کەسێکی نزیکی خۆمان فرمێسکەکانی دەسڕیین، بەڵام خۆیشی نەیدەتوانی پێش بە فرمێسکەکانی بگرێت و دەستی دەکرد بە گریان. ڕۆژی دواتر ئیلهام لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و زاواکەی هاتن بۆلامان، گوڵ و شیرینیان بۆ هێنابووین، ئەوان هێندە نیگەران بوون، کە لەبەر گریان نەیانتوانی قسە لەگەڵ ئێمە بکەن. ئەو ڕۆژە پارێزگاری شاری (ئیزمیر) و یەکێك لە بەرپرسە باڵاکانی وەزارەتی ناوخۆی تورکیاش هاتن بۆلامان، زۆر دڵنەواییان کردین و پێیان گوتین ئێوە جارێکی تر لەم وڵاتە لەدایکبوونەوە و ئەگەر ڕەزامەندیتان لەسەر بێت مافی هاوڵاتی بوونتان پێ دەبەخشین، ئەو بەڵێنانە بۆ ئێمە هیچی لە ئازار و مەینەتییەکان کەم نەدەکردەوە، بۆیە هیچ کامێکمان دڵمان

پێخۆش نەبوو، ئاخر مانەوە بۆ ئێمە لەو وڵاتە هیچ مانایەکی نەبوو و هیچ کامیشمان دوای ئەو مەرگەساتەی بەسەرمان هات بەلامانەوە گرنگ نەبوو لەکوێ دەژین.

هەر ئەو رۆژە ئەفسەرێکی پۆلیس هاتە لامان، پێی راگەیاندین، کە قاچاغچییەکانیان دەستگیر کردووە و دەستیان بەسەر ئۆتۆمبێلەکەشدا گرتووە، ئەو وتی رێژمیەکی زۆر پارەی ساختەشیان لێ گیراوە، بەڵام وتی ئەو قاچاغچییانە سەر بە باندێکی زۆر گەورەی مافیایین، کە لە نێوان تورکیا و یۆنان و ئیتاڵیا کار دەکەن.

رۆژی سێیەمی نەخۆشخانەی (چەشمە) یەکێک بوو لە ناخۆشترین رۆژەکانی ژیانمان، ئەو رۆژە هێندە ناخۆش بوو، کە تەمەنای ئەوەمان دەکرد لە دەریا رزگارمان نەبووایە، چونکە زوو زوو دەهاتن بە شوێنماندا و دەیانبردینە سەر تەرمی یەکێک لە هاورێکانمان و دەیانویست ناو و ناونیشانەکانیان پێ بدەین. زۆر رۆژێکی سەخت بوو و بەڕاستی ئاستەم بوو مرۆڤ خۆی پێ رابگیرێت، لەگەڵ بینینی هەر تەرمێك کارەساتەکە بۆ ئێمە نوێ دەبۆوە و ناخمان دەکوڵا، هیچ یەکێکمان حەزمان بەوە نەبوو بچینە سەر تەرمی هاورێکانمان، بەڵام ناچاری بوو و دەبوایە ئەو کارە بکەین و تەرمەکان بناسینەوە و ناوەکانیان بدەینە کارمەندەکان. چوین و ئەو کارەمان کردو ناو و ناونیشانی بیست و یەك تەرممان تۆمارکرد. ئەو ناو و ناونیشانانە بۆ ئەوە

بـوو تــا بیــدەن بــە شــارەوانی و تەرمــەکان بەخــاك بسـپێردرێن و ناونیشانەکانیش بخرێتـە سـەر گۆڕەکانیـان تا ئەو کاتەی کەسوکاریان پەیـدا دەبـن. لـە راسـتیدا هەمـوو بانـگ کردنێکمـان بـۆ سـەیری تەرمـی هاورێکانمـان مردنێکـی پـڕ لـە ئـازار بـوو، ئازارێـك بـوو کـە ئێستاش لـە بیرمدایـە و چارەسـەر نابێـت، ئاخـر ئەوانـە هەموویـان هاورێمـان بـوون، هەموویـان وەك ئێمـە ژیانیـان خـۆش دەویسـت و هەوڵـی ئاسـودەبوونیان دەدا، کـە چاومـان پێیـان دەکـەوت دونیایـەك یادگاریمـان بیـر دەکەوتـەوە، ئیتـر ئـەوە چ قەدەرێـك بـوو وای بەسـەر ئێمـە هێنـا، ئـەوان جەسـتەی بـێ گیـان بـوون و ئێمەش جەسـتەیەك لێـوان لێـو لەخـەم و روخـان بوویـن. ئـەوەی جارێکـی تـر ئـازاری دەدایـنـەوە لـەو چەنـد رۆژەی لـە نەخۆشـخانە مایـنـەوە دیـار نەبوونـی تەرمـی هیـچ یەکێـك لـە منداڵـەکان و چەنـد هاوڕێیەکـی تـر بـوو، ئێمـە دەمانزانـی ئاسـان نییـە دۆزینـەوەی ئـەوان، چونکـە دڵنیابوویـن کـە منداڵـەکان لەنێـو بەلەمەکەدابـوون و نقـوم بـوون بـەڵام ئەوانـەی تـر چییـان بەسـەر هاتـوە؟!

لـەو چەنـد رۆژەی لـە نەخۆشـخانە بوویـن خەڵکێکـی زۆر سـەردانیان کردیـن، لـە نێویانـدا چەندیـن رێکخـراوی نێودەوڵەتـی و تورکـی بوون، بەشـێکی زۆریـان جگـە لـە پێشکەشـکردنی هـاوکاری مـادی لـە رووی مەعنەویشـەوە هاوکارمـان بـوون، بەشـێك لـە رێکخـراوەکان کاریـان بـۆ ئـەوە دەکـرد، کـە دوای رێوشـێنە یاساییەکان بمانگوازنـەوە بـۆ وڵاتانی تـر.

دوای پێنج رۆژ مانەوەمان لە نەخۆشخانەی چەشمە و وەرگرتنی چارەسەری پزیشکی، بەرەو ناحیەی (قەرەبروون) بەڕێ کراین، تێگەیشتین کە ئێمە لەکەنار ئاوەکانی ئەو شارۆچکەیە سەفەرمانکردووە و چوینەتە نێو دەریا، بۆیە لەوێ لە سەربازگەیەك دایاننایین و رۆژی دواتر بردینیانە دادگا بۆ ئەوەی ئیفادەی خۆمان بدەین، لەو دادگایە یەکە یەکەمان بانگکراین و لێکۆڵینەوەمان لەگەڵدا کرا، وەرگێڕێکی عەرەبی ژن لەوێ بوو، کە خەڵکی شاری (ئۆرفە)ی باکوری کوردستان بوو، عەرەبییەکەی ئەوان جیاوازییەکی ئێجگار زۆری هەبوو بە ئاسانی نەماندەتوانی لێی تێبگەین. پۆلیس ئەو قاچاغچییانەی دەستگیری کردبوون رادەستی هەمان دادگای کردبوون، قاچاغچییەکان گروپێکی مافیایی گەورە و بەهێز بوون، دادگا لێیان نەشاردینەوە، کە مەترسی لەسەر ژیانی ئێمە هەیە و مافیاکان بەدوامانندا دەگەڕێن، هەڵبەت بۆیان روونکردینەوە کە مافیاکان دەیانەوێ ئێمەیان بەردەست بکەوێت تا نەبینە شاهێد لەسەر کارەکانیان. لەدانپێدانانی قاچاغچییەکاندا ئەو پارە ساختەیەی لێیان گیرابوو کردبویان بە هی ئێمە و گوتبوویان، کە نەفەرەکان ئەو پارەیەیان وەك حەقی رێگە پێداوین، لە راستیشدا ئێمە بەشێك لە نەفەرەکان هیچ بڕە پارەیەکمان نەدابوو، چونکە رێککەوتنمان وابوو کە گەیشتینە ئەسینا پارەکەیان بدەینێ تەنها چەند کەسێك پارەی تەواویان دابوو. دوو شەو لە قەرەبروون ماینەوە و دادگا بڕیاری

ناردنـەوەی بـۆ دەرکردیـن بـۆ وڵاتـی خۆمـان، پـێ دەچـوو دادگا لەژێـر گوشـاری بانـدە مافیاییەکـە ئـەو بڕیـارەی دابێـت، بـەڵام هەرچـی بێـت بـۆ ئێمـە گرنـگ نییـە، کەسـمان خەیاڵمـان لای بڕیارەکـەی دادگا نەبـوو، ئێمـە بەشـێوەیەك تاسابووین ئـەوەی بەلامانـەوە گرنـگ نەبـوو، شـوێنی ژیانـی ئاینـدە بـوو. کەسـمان پێمـان ناخـۆش نەبـوو بگەڕێینـەوە نێـو کـەس و کارمـان، بـەڵام بەشـێکمان ترسـی ئەوەمـان هەبوو، کە بگەینەوە وڵات و سـزای سیاسییمان بەسـەردا بسـەپێنرێت، مـن یەکێـك بـووم لـەو کەسـانەی ئـەو ترسـەم هەبـوو. ڕۆژی دواتـر بـەرەو شـاری (ئیزمیـر) بـەڕێ کرایـن، لەگـەڵ گەیشـتنمان بـەو شـارە زۆر نامرۆڤانـە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا کردیـن، ئێمـە بـەو بارودۆخـە خراپـە دەروونـی و جەسـتەییەوە خراینـە زیندانی پۆلیسـی ئەو شـارە، زیندانەکـە لـە ژێرزەمینـی بینـا چەنـد نهۆمییەکـەی پۆلیسـی ئـەو شـارەدا بـوو، زینـدان هۆڵێکـی گـەورە و پاکوخاوێـن بـوو، بـە شیشـی ئەسـتور ژوورەکان دروسـتکرابوون، هەمـوو ژوورەکان لەیەکـەوە دیـار بـوون و یەکتریمـان دەبینـی. ئێمـە خراینـە یـەك ژوور، دوو کەسـی تریشـی تێـدا بـوو، یەکیـان ڕۆمانـی بـوو ئـەوەی تریشـیان تـورك، جگەرەکێشـان لـەو زیندانـە قەدەغـە بـوو، بارودۆخمـان هێنـدەی تـر سـەخت بـوو، بـەڵام ئـەوەی لـە هەمـووی ناخۆشـتر بـوو سـەردانی هەندێـك لـە کەسـوکاری هاوڕێکانمـان بـوو، بەتایبـەت کەسـوکاری ئـەو هاوڕێیانەمـان کـە گیانیـان سـپاردبوو و بـەدوای ڕاسـتی ڕووداوەکـە و چارەنووسـی ئازیزانیانـدا دەگـەڕان، یـان دەیانویسـت شـوێنی

تەرمەکانیان بزانن. ئەو ساتانە هێندە ناخۆش بوون کە حەزمان بە گێڕانەوەی ڕووداوەکە نەدەکرد، هەر شەش کەسەکە هەوڵمان دەدا بێدەنگ بین، بەڵام ئەوان پرسیارییان دەکرد، ئاخر چۆن مرۆڤ دەتوانێت بەرامبەر عوسمان خۆشناو دابنیشێت و باسی خنکانی خێزان و سێ لە منداڵەکانی بۆ بکات، چۆن دەتوانی باسی مەرگی براو برازای ئەوانەی تر بکەیت، چ هێزێك دەتوانێ لەو کاتەدا دیمەنە تراژیدیەکانی کەسوکارەکانیان بخاتە بەرچاو!!؟.

بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە وەڵامی پرسیاری یەك بەیەکی ئەوانمان دایەوە. بەداخەوە هەواڵی مەرگی کەسوکارەکانیانمان پێ وتن، زۆر سەخت بوو، بەڵام گوتنی باشتر بوو لە شاردنەوەی. هەرچەندە خۆیان دڵنیابوون کە کەسیان نەماوە، بەڵام ئەوانیش بەدوای هەواڵە دروستەکەدا دەگەڕان. لەنێو ئەو کەسانەی سەردانیان کردین کاك فەرهاد مامی کریفۆی هاوڕێم بوو، ئەو لە وڵاتی ئەڵمانیاوە بۆ زانینی هەواڵی برازا تاقانەکەی گەیشتبۆ شاری ئیزمیر و هاتە لامان، ئەو هێندە پیاوێکی بەسۆز و میهرەبان بوو زیاتر لە برازا تاقانەکەی دڵی ئێمەی دایەوە و دڵنەوایی کردین. لەوێ لەدەمی ئەوانەوە بیستمان کە دوو هاوڕێی تریشمان ڕزگاریان بووە ئەوەش هەواڵێکی خۆشبوو، بەڵام نەمانزانی کە چۆن ڕزگاریان بووە و چۆن نەکەوتونەتە دەست پۆلیس! دوای دانیشتنێکی دوور و درێژ لەگەڵ کەسوکاری هاوڕێ خنکاوەکانمان، گفتوگۆ لەبارەی چارەنووسی ئێمەش کرا، ئەوان بەڵێنیان بە ئێمەدا کە هەوڵ

بدەن لە کوردستان ڕێزمان بگیرێت و هیچ کەسێك سزای سیاسی نەدرێت، هەریەکە لە عوسمان خۆشناو و سەرهەد غەفوریی، چەند جارێك ئەو بەڵێنەیان دووپاتکردەوە و دڵنیایان کردین، کە خۆیان چاودێری گەڕانەوەمان دەکەن، ئەو دوو کەسە بەرپرسیارییەتی گرنگ و هەستیاریان هەبوو لە کوردستان و ئێمەش دەنێردراینەوە ژێر دەسەڵاتی ئەوان.

ئەو ساتە سەختانەشمان لەگەڵ کەسوکاری هاوڕێ خنکاوەکانمان تێپەڕاند، بەڕێوەبەرایەتی زیندان ڕێگەیان پێداین هەریەکەمان چەند خولەکێك پەیوەندی بە کەس و کارمانەوە بکەین، ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار پەیوەندیم بە مامم (ئالان)ەوە کرد، کە لە وڵاتی سوید دەژیا و ئاگادارم کردەوە کە من سەلامەتم، هەرچەندە لە ڕێی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانەوە هەواڵی ڕزگاربوونی منیان پێگەیشتبوو، بەڵام نەیاندەزانی چارەنووسی دوای ڕزگاربوونمان چییە، لەو پەیوەندییەدا مامم هێندە دڵتەنگ بوو نەیتوانی خۆی ڕاگرێت و بەدەم گریانەوە پرسیارەکانی کرد، هەرلەو پەیوەندییەدا مامم هەواڵی ڕزگاربوونی دوو هاوڕێی تری پێدام، کەمێك باری دەروونی ئاسودە کردم و دڵخۆش بووم، ئەوانیش سەردار ڕواندزی و شوان کەلەکی بوون، من هەر ئەوەندە دەرفەتم ما پێمگوت کە ئێمە سنورداش دەکەنەوە، بەڵکو کارێك بکەن دەستگیر نەکرێم و ئازار نەدرێم، ئەو وتی کاری جددی لەسەر دەکەین و پەیوەندییان بە زۆر شوێنەوە کردبوو تا ڕزگارم بکەن.

دوای دوو رۆژ لـە مانەوەمـان لـە زیندانـی پۆلیسـی شـاری ئیزمیـر، خراینــە نێـو پاسـێك و لـە ڕێوشـوێنێکی تونـدی ئەمنیـدا بـەرەو سـنوری کوردسـتان بـەڕێ کرایـن. دوای نزیـك بـە ٣٠ کاتژمێـر لـە سـنوری (ئیبراهیـم خەلیـل)ەوە گەیشـتینەوە خاکـی کوردسـتان، بـەر لـەوەی بگەینـەوە خاکـی کوردسـتان ئێمـە ئـەو شـەش کەسـە پێمـان وابـوو، کـە پێشـوازی دەکرێیـن و ڕێزمـان لـێ دەگیرێـت، چونکـە لـە کارەسـاتێکی مەترسـیدار رزگارمـان بـووە و لـە ئیزمیریـش دوو بەرپرسـی گـەورە بەڵێنـی ئەومیـان پێدابوویـن، کـە ڕێزمـان لـێ بگیرێـت، بـەڵام نـە بیرکردنـەوەی ئێمـە لـە جێـی خۆیدابـوو و نـە بەڵێنەکانـی ئـەو دوو بەرپرسـەش، بەڵکـو مەرگەسـاتێکی تـر لێـرەوە دەسـت پـێ دەکات.

ئێمـە لـە کارەسـاتێکی گـەورە رزگارمـان بـوو، جیهانـی دەرەوە گرنگیـان بـەو کارەسـاتەدا و تەنانـەت داوا لـە دەوڵەتێکـی وەك تورکیـا کـرا، کـە ڕێگـری بـکات لـە ئەگـەری دووبـارە بوونـەوەی کارەسـاتی لـەو شـێوەیە. هەربۆیـە ئێمـە پێمانوابـوو، کـە لەوڵاتـی خۆمـان هاوسـۆزی و هاوخەمـی زیاتـر لەبەرامبەرمانـدا دەگیرێتەبـەر و ڕێزمـان لـێ دەگیـرێ، وامـان دەزانـی کـە دەگەینـەوە خاکـی کوردسـتان لەلایـەن بەرپرسـانەوە پێشـوازیمان لـێ دەکرێـت و داوامـان لـێ دەکـەن، کـە هەریەکەمان لەکەناڵەکانی راگەیاندن و بە نووسـین بەسـەرهاتەکەمان بگێڕنــەوە، بـۆ ئـەوەی چیتـر هاوڵاتیانمـان نەبنـە قوربانـی لـەو ڕێـگا سـەخت و پـڕ مەترسـیانە. بیرمـان لـەوە دەکـردەوە، کـە ئێمـە

تـازە لەدایکبوویـن و نـەك لێپێچینەوەمـان لەگـەڵ ناکرێـت، بەڵکـو بەوپـەڕی ڕێـزەوە دەمانگەیەننـەوە باوەشـی کەسـوکار و خێزانمـان، بـەڵام ئـەو بیرکردنەوانەمـان لەگـەڵ یەکـەم هەنگاومـان خستـە سـەر خاکـی کوردسـتان پێچەوانـە بوونـەوە.

کە گەیشتینەوە نێو خاکی کوردستان پێچەوانەی بیرکردنەوەکانمان ڕاستبوو و بە ناشیرینترین شێواز پێشوازیکراین.وا دەستگیریانکردین وەك ئـەوەی گەورەتریـن تاوانبـاری جەنـگ و ئەنجامدەرانـی جینۆسـایدیان ڕادەسـتکرابێتەوە، ئـەوان لەسـەر پـردی ئیبراهیـم خەلیـل ئێمەیـان بـە قۆڵبەسـتراوی خسـتە پشـتی ئۆتۆمبیلێکـی ئاسـایش و ڕاپێچـی زیندانـی ئاسایشـی زاخۆیـان کردیـن. هـەر ئـەو شـەوە دەسـتکرا بـە لێکۆڵینـەوە لەگەڵمـان، هیـچ سـوکایەتیەك نەمـا بەرامبـەر مـن نەکرێـت و لێکۆڵینـەوەی سیاسـیم لەگـەڵ کـرا. لەنێـو هاوڕێکانمـدا بەتەنها مـن وەك زیندانـی سیاسـی مامەڵەم لەگـەڵ کـرا. ڕۆژی دواتـر لەژێـر ڕێوشـوێنێکی ئەمنـی توندـدا بـەرەو ئاسایشـی دهـۆك گوازراینـەوە، دەمـەو ئێـوارە ئێمەیـان بـردە یەکێـك لـە کەناڵـە تەلەفزیۆنیـەکان، دەسـتکرا بـە چاوپێکەوتـن لەبـارەی ڕووداوەکـەی دەریـای ئیجـە. دوای بەرنامەکـە براینـەوە بـۆ زیندانـی ئاسـایش، وا پێدەچـوو زیندانەکـە لەنێـو کۆنـە هۆتێلێـك بێـت، لـەوێ کەوتمـە بیرکردنـەوە، ئاخـر دوو مانـگ بـەر لـە ئێسـتا لەترسـی ئـەو هەڵسوکەوتانە مـن وڵاتـم جێهێشـت و ڕووبـەڕووی دەیـان مەترسـی بوومـەوە دواجـار لـە قوڵایـی دەریـای ئیجـە هاتمـە دەرەوە و ئیجـە

نەیخنکاندم، بەڵام ئێستا چارەنووسم مەترسیدارترە لەو شەوەی لەنێو شەپۆلەکاندابووم! خودایە دەبێ چیم بەسەر بێت، من دەزانم رەنگە لەجیاتی کەسوکارم سزای سیاسیم بەسەردا بسەپێنرێ، تۆ بڵێی مامەڵەیان لەگەڵمدا نەگۆڕێ؟ جار جارەش لەبەر خۆمەوە دەمگوت منێکی بیست ساڵان بۆ دەبێ سزای سیاسی بدرێم؟ خۆ من تازە لە دایکبوومەتەوە، کام ویژدانە ئازاری من دەدات؟! ئەو خەیاڵ و بیرکردنەوانەم شەوگاری تێپەڕاند و رۆژی بەسەرداهات. من لە ژوورێك بووم لەگەڵ دوو کەس، یەکیان ناوی دیندار بوو و ئەوی تریشیان ناوی شێخ شڤان بوو، دوو کەسی بەڕێز بوون. کە بەسەرهاتی ئێمەیان زانی زۆر دڵنەواییان کردم و خزمەتێکی زۆریانکردم، وادیار بوو هەریەکەیان سێ مانگ زیاتر بوو لەو زیندانەدا بوون. ئەوان باسیانکرد کە دادگایی نەکراون و لەلایەن حزبەوە دەستگیرکراون و هێناویانن بۆ زیندانی ئاسایش، بەڵام ئەوەی سەرنجی راکێشام کەیسی بەندکردنی هەردووکیان بوو. دیندار بە تۆمەتی هاوکاریکردنی پەکەکە گیرابوو و شێخ شڤانیش بەتۆمەتی ئەندامیەتی دەزگای هەواڵگری تورکیا (میت) گیرابوو! لەگەڵ ئەوەی کەیسەکانیان زۆر دژ بەیەك بوو، بەڵام زۆر بووبونە برادەر، هەردوکیشیان تۆمەتەکانیان رەت دەکردەوە. ئەو رۆژە نانی بەیانیم لەگەڵ ئەوان خوارد و دوای نانخواردن بانگکرام کە ئامادە بم بۆ گواستنەوەم بۆ هەولێر. ماڵئاواییم لە شێخ شڤان و دیندار کرد، دەرگا کرایەوە و بردیانن

بەرەو ئەو ئۆتۆمبێلەی، کە ئامادەیان کردبوو بۆ گواستنەوەمان. نزیک کاتژمێر نۆی بەیانی بەرەو هەولێر بەڕێکەوتین، چەندین پاسەوانمان لەگەڵ بوو، پەردەی ئۆتۆمبێلەکە دادرابۆوە، نەیاندەهێشت بەهیچ شێوەیەك سەیری دەرەوە بکەین. ڕێگایەکی دوور و درێژ و ناخۆش، تا بڵێی گەرم، تەواوی جەستەمان نوقمی ئارەق بوو. لە تەواوی ڕێگاکەدا لە بیرکردنەوە دابووم، وەك چۆن لە نێو شەپۆلەکانی دەریادا تەواوی ژیانی خۆم دەهاتەوە بەرچاو، لەوێشدا وابووم. ترسی من لە نێو قوڵایی دەریا تەنها مەرگ بوو هەوڵم دەدا چەند خولەکێك زیاتر بژیم، بەڵام لێرە بیر لە چارەنووسی نادیارم دەکەمەوە، دەمگوت دەبێ چی چاوەڕێم بکات؟ لە هەموو بیرکردنەوەکانم لە سزای سیاسی دەترسام بەهۆی ئینتمای سیاسی کەسوکارەکەم. ناوەناوەش دەمگوت تۆ بڵێی دەسەڵاتی کوردی هێندە بێویژدان بێت، کە گەنجێکی بیست ساڵان سزا بدات، کە تازە بە موعجیزە گیانی لە مەرگ ڕزگار بووە؟ بەڵام، کە بیریشم لە ساتەکانی شەڕی ناوخۆ دەکردەوە و چیرۆکی بێسەروشوێنکردن و کوشتنی گەنجانی ئەو وڵاتەم دەکەوتەوە یاد، بەتەواوی دەڕوخام و بێ هیوا دەبووم. پێش تاریکبوون گەیشتینە نێوشاری هەولێر، پاسەکەمان لەنێو حەوشەی بینایەی ئاسایشی گشتی وەستا، ئێمەیان لە زیندانیانی تر جیاکردەوە، ئەو زیندانیانەی تر لە دهۆك لەگەڵ ئێمە هێنابونیان بەرەو شوێنێکی تر بردنیان. ئێمە ئەو شەش کەسەی دەربازبووی کارەساتەکەی

دەریای ئیجە لە نێو حەوشەی ئاسایشی گشتیدا راگیراین و پیاوێك، کە تەمەنی لە سەرووی پەنجا ساڵەوە بوو هاتە لامان، ئەو هەردوو دەستی خستبوە پشتیەوە و دەستی کرد بە قسەکردن بۆمان، رەفتار و قسەکانی هیوابەخش بوون، پێچەوانەی دوو رۆژی رابردووی ئاسایشی زاخۆ و دهۆك قسەی دەکرد. هاوسۆزی و هاوخەمی نیشاندا لە بەرامبەر ئەو کارەساتەی بەسەرمان هاتووە، ئەو گوتی ئێوە سەر بە هەر لایەنێك بن، دژ یان دۆستی پارتەکەی ئێمەش بن، تەنها ئەگەر تاوانی کوشتنتان نەکردبێت ئێمە ئازادتان دەکەین، ئەو ئاوای بە ئێمە گوت، دواتر ئەو ماڵئاوایی کرد و رۆیشت. ئەفسەرێك بەرێزەوە ئێمەی بردە ژوورێك، پێ دەچوو ژوورەکە هی پێشوازی میوانان بێت، تەلەفۆنێك لەسەر مێز دانرابوو، پێی گوتین کێ کەسوکار یان ئاشنایەکی لێرەیە با پەیوەندی پێوە بکات و بێت بەدواتاندا، ئەو گوتی دەبێ کەسێك بێت ئەگینا ناچارین لێرە بتانهێڵینەوە، من تەنها ژمارە تەلەفۆنی ئاشنایەکم بیر مابوو بۆیە تەلەفۆنم بۆ کرد و داواملێکرد کە بێت بەدوامدا، دوای نیو کاتژمێرێك هات و لەگەڵ خۆی بردمیەوە ماڵی خۆیان. چەند خولەکێك دانیشتم و داوایان لێکردم کە بۆ پشودان دوشێك بکەم، چومە حەمام و خەریکی خۆشوشتن بووم لە دەرگایاندا کە پەلە بکەم. بەپەلە هاتمە دەرەوە و گوتیان ئاسایش هاتووە بەدواتدا چەند پرسیارێکت لێ دەکەن، ئاسایشەکان دوانیان هاتبوونە ژوورەوە، بۆیە ناچار بووم لەگەڵیان برۆم. منیان

خستە سەیارە و کەوتنە رێ سەد مەترێك لەماڵەکە دوور کەوتینەوە کەسێك دەستێکی خستە پشت سەرم و داوای لێکردم سەر دانەوێنم، هەردوو دەستی لەپشتەوە کەلەپچە کردم، ویستم پرسیار بکەم رێگەیان نەدام. بردیانمەوە هەمان ئەو شوێنەی، کە ئێوارە پیاوە سەر سپییەکە بە قسەکانی دڵخۆشی کردم، سەیرمکرد هەمان پیاو لەو شوێنە وەستابوو پرسیاری ناوی لێکردم، هەر کە ناوی خۆم گوت بە بۆکس و زللە کەوتە گیانم، هەرچی قسەی ناخۆش و ناشیرین بوو پێی گوتم، تا هیلاك بوو لێیدام دواتر گوتی بیبەنە ژوورەوە. سەرەتا بردمیانە ژوورێك تەنها کەسێکی لێبوو، وتی هەر شتێکت پێیە لەسەر ئەو مێزە دایبنێ، داوای قایشی پانتۆڵ و ئەو چەند رۆژنامە تورکیەی کرد کە بەدەستمەوە بوون(ئەو رۆژنامانە هەواڵی نوقومبوونی بەلەمەکەی ئێمە و چاوپێکەوتنی ئێمەی تێدا بڵاو کرابۆوە بۆیە لەگەڵ خۆم هێنابوونمەوە) ئەوشتانەم خستە سەر مێزەکەی بەردەمی، وتی هەرچەند پارەت لایە ئەویش لەسەر مێزەکە دانێ، نزیك بە دوو هەزار مارکی ئەڵمانیم پێ بوو لێی وەرگرتم، هەموو ئەو شتانەی لە فۆرمێك تۆمارکرد و دواتر بردیانمە ژوورێکی تاکەکەسی، ئەوەی جێی سەرسوڕمانی من بوو، کوا دەشێ کەسێك لە نێوان دوو کاتژمێردا ناوا بگۆڕێت و دوو هەڵسوکەوتی دوور لە یەکتری بکات! ئێوارە قسەکانی چەندە میهرەبانانە و مرۆڤانە بوو، چەندە هیوای پێ بەخشیم، ئەی ئێستا چۆن باوەڕ بکەم، کە ئەو پیاوە هەمان

ئەوەی ئێوارەیە!. ئەو شەوە هێندە شەکەت بووم نازانم چۆن گوزەراوە، ئەم دەزانی ئازاری جەستەم هەیە بەهۆی لێدان یان برسیم؟ کەمێك خەوم لێکەوتبوو، بەڵام هێندە گەرم بوو ئێستاش گومان دەکەم، کە ئەوە خەوێکی ئاسایی بوبێت، رۆژ بۆوە هێندە بێهێز بووم نەمدەتوانی سەر هەڵبڕم. دەرگا کرایەوە قاپێك نیسك و سەمونێکی کۆنیان خستە پێشم، داوای ئاوم کرد بۆیان نەهێنام، لەبرسانا سەمون و نیسکەکەم خوارد و هەستمکرد نەختێك هێزم هاتۆتەوە بەر. نزیکی نیوەڕۆ بوو دەرگا کرایەوە، دوو کەس هاتنە ژوورەوە و دەستەکانمیان راست و چەپ لە پشتەوە بەستەوە، بێ ئەوەی تەنها پرسیارێکم لێ بکەن کەوتنە لێدانم، تا ماندووبوون لێیاندام دواتر بە هەردوو دەستەکانم هەڵیانواسیم و بەجێیان هێشتم، وا هەستدەکەم نزیك بە کاتژمێرێك هەڵواسرابم، دیسان دەرگا کرایەوە و ئەو دوو کەسە هاتنەوە ژوورەوە و هێنامیانە خوارەوە و دەستەکانمیان کردەوە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەمدەتوانی قۆڵەکانم بجوڵێنم، وا پێدەچوو هەردوو قۆڵم لە جێ دەرچووبن. ئەوان زۆر شارەزا بوون، بۆیە بە چەند جووڵەیەك کرتەیەك لەشانم هات و پێدەچو خستبێتیانەوە شوێنی خۆی. خەریکبوو لە تینویان دەخنکام، دیسان داوای ئاوم کرد وەڵامیان نەدامەوە، سەیربوو لە کەڕ و لاڵ دەچوون ئەو هەمووە لێیاندام خۆ قسەیەك لە دەمیان نەهاتە دەرەوە. دەمەو ئێوارە دەرگا کرایەوە و قاپێك ساوەری وشك و سەمونێکیان خستە بەردەمم، دیسانەوە

داوای ئاوم کرد، ئەوجارە هەندێك ئاوی گەرمیان بۆ هێنام و بە ناچاری خواردمەوە، قۆڵ و شانەکانم ئەوەندە ئازاریان هەبوو نەمدەتوانی بە ئاسانی جوڵە بکەم، ئەو شەوە بەهۆی ئازارەوە خەوم لێنەکەوت. ڕۆژی دواتر دەرگا کرایەوە و دیسان دەستەکانم لە پشتەوە کەلەپچە کران، بردیانمە دەرەوە و لە نێو داڵانێك ئەفسەرێك لەپاسەوانەکانی پرسی بۆ کوێی دەبەن، ناوی ئەفسەرێکی پلە (لیوا) یان هێنا کە بۆلای ئەوم دەبەن، کە بردیانمە ژوورەکە، ئینجا تێگەیشتم ئەو کەسە میهرەبانەی دوێنێ ئێوارە و دڕندەکەی دوای مەغریب کێیە. کە بردیانمە بەردەمی بە شێوازێکی زۆر ئاست نزمانە دەستیکرد بە هەڕەشە و جنێودان، چەندینجار لەسەر یەك پێیگوتم دەتکوژم و دەتتۆپێنم تۆ بەچکە جەلالی و برازای (نیاز دەرگەڵەیی)، ئێمە لە ئاسمان بەدواتاندا دەگەڕاێین لەسەر زەوی کەوتنە دەستمان. گوتم ئاخر من چیم کردووە خۆ دیلی شەڕ نیم؟ خێرا پاسەوانێك مشتێکی کێشا بەنێو دەمماو پڕی کرد لەخوێن و گوتی قسە نەکەی بەس گوێ بگرە. ئەو بەرپرسە کە پلەی لیوای ئاسایش بوو، بە پێکەنینێکی دڕندانەوە بە پاسەوانەکانی گوت بەپەلە بیگەیەننە مەسیف. لەوکاتەدا خەیاڵم لای پێنج هاوڕێیەکەی ترم بوو، دەمگوت تۆ بڵێی ئەوانیش بە هەمان شێوە گیرابنەوە و وەك منیان لێ کردبن؟ بەڵام وادیار بوو ئەوان ئازاد کرابوون و ئەوەی کێشەی بۆ دروستبووە تەنها منم. پاسەوانەکان قۆڵیان ڕاکێشام و بردیانمە دەرەوە، وادیار بوو

ئۆتۆمبێل ئامادە کرابوو، خستمیانە پشتی ئۆتۆمبێلێك و پاڵیانخستم و بەرەو مەسیف کەوتنە ڕێ. بەر لەوەی بگەینە ناو ئەو بینایەی منیان بۆی دەبرد، توند چاوەکانیان بەستم، لە ئۆتۆمبێل دایانبەزاندم، بەپێی ئەو قسانەی گوێم لێبوو تێگەیشتم کە چاوەڕێیان کردووم. دوای دوو خولەك ڕۆیشتن، بە قادرمەیەکدا بردیانمە خوارەوە و گوێم لەدەنگی کردنەوەی دەرگا بوو، بردیانمە ئەودیو دەرگاکە، بەرلەوەی دەست و چاوم بکەنەوە بەچەند کەسێك ئەشکەنجەیاندام، ئەوان ماندوو نەدەبوون لە ئەشکەنجەدان و ماوەیەکی زۆر لەسەر زەوی کەوتبووم ئەوان هەر وازیان نەدەهێنا. دوای ماوەیەك دەست و چاویان کردمەوە و خستمیانە ژورێکی بچوکی تاریك، کە تەنها مەترێك بە مەترێك دەبوو، تا چەند کاتژمێرێك هیچ دەنگێکیشم گوێ لێ نەبوو. شەو بێئاگا بووم کاتێك شەقێکیان لە دەرگاکەدا و بە هەموو هێزی خۆی دەرگاکە بەر لای چەپی جەستەم کەوت زۆر ئازاریدام، نەختێك خواردن و ئاویان پێدام و دەرگاکەیان داخستەوە. دوای خواردنەکە و کەمبوونەوەی ئازارەکەم خەوم لێکەوت، کە خەبەرم بۆوە ئیتر لەو کاتەوە تا ئەو ڕۆژەی لەو زیندانە گواستیانمەوە نەمدەزانی چ کاتێکە تیایدا دەژیم، شەوە یان ڕۆژ! چونکە تەنها تروسکایێك دیار نەبوو، تەنها کاتێك ڕووناکی گڵۆپێکی کز دەردەکەوت، کە دەهاتن بمبەن بۆ لێکۆڵینەوە یاخود بۆ نان خواردن و تێهەڵدان. ئەو ڕۆژانە زۆر سەخت و نەبڕاوە بوون، نەمدەزانی هۆکاری گرتنی

من چیە؟ ئاخر ناشێ و ئاسایی نییە من لەسەر کەسوکارەکەم بگیرێم، کە بیرم لەو هەموو ئەشکەنجە بێ بەزەییانەی ئەوان دەکردەوە بەبەر خۆمەوە دەمگوت بڕیاری ڕۆیشتنم لەم وڵاتە بڕیارێکی دروست بوو، خۆ ئەگەر دەرفەتی ئەوەم بێتەوە پێش شەو و ڕۆژێك لەو وڵاتە نامێنمەوە. لەگەڵ ئەوەشدا قسەکانی باپیرمم بیر دەکەوتەوە، کە پێیگوتم سنورداش بکرێیتەوە دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچەیە دەستگیرت دەکەن و دەتکوژن. ئاخر باپیرم درکی بە ڕقی ئەوان کردبوو و باشیش دەیناسین، چونکە تەمەنێکی زۆری لەگەڵ ئەوان بەسەر بردبوو. بیرکردنەوەکانم تا دەهات ئاڵۆزتر دەبوون، زۆر جاریش، کە بەهۆی ئەشکەنجە لەژیان بێزار دەبووم گلەییم لەخۆم دەکرد، کە بۆ هێندە ململانێم لەگەڵ شەپۆلەکانی دەریای ئیجەدا کرد و رادەستیان نەبووم. دەمگوت هاوڕێکانم چەندە بە ئاسانی رزگاریان بوو لەو ژیانە بێمانایە، ئەی بۆ قەدەری من وابوو هەر دەبێ رەنج بکێشم؟ ڕۆژانە لەگەڵ ئەشکەنجە و بیرکردنەوە شەو و ڕۆژە تاریکەکانم تێدەپەڕاند کە لێکیشم جیا نەدەکردنەوە. ئەو کەسەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا دەکردم کاربەدەستێکی باڵای پاراستن بوو، مەلەفی من لەژێردەستی ئەودابوو، ناوە ناوە بە چاو بەستراوی دەیانبردمە ژورێکی تر، ئەو لەوێ دەبوو کێبڵێکی بەدەستەوە بوو وا پێدەچوو تەلەکانی لەو سەرەوە هاتبوونە دەرێ و خوار کرابوونەوە، هەرکێبڵێك بەر جەستەم دەکەوت شوێنێکم برینداد دەبوو. پرسیاری زۆر بێمانای

لێم دەکردم، هیچکام لە پرسیارەکانی وەڵامی لای من نەبوو. ئەو دەیویست من کۆمەڵێك ناوی پێبدەم، کە پەیوەندییان بەکەسوکاری منەوە هەبێت و بڵێم ئەوانە کار بۆ یەکێتی دەکەن، منیش نە دەمزانی کێ پەیوەندی لەو جۆرەی هەیە و نە ئاگاداری کاری سیاسی لەو شێوەیەش بووم. ئەویش بێویژدانانە گوێی بەهیچ بەهایەکی مرۆڤانە نەدەدا و تا هیلاك دەبوو لێیدەدام، کە خۆشی هیلاك دەبوو جەللادەکانی دەوروبەری دەکەوتنە گیانم.

ئەو ئەشکەنجەدانە بیست رۆژێکی خایاند، تا رۆژێك بردیانمە نهۆمی سەرەوەی بیناکە، دوو کەس قۆڵیان گرتبووم و دەست و چاوم بەسترابوون. لەنێو دالانێك پیاوێك لەو پاسەوانانەی پرسی ئەوە بۆ کوێی دەبەن؟ گوتیان بۆ ژووری ئەفسەری لێکۆڵینەوەی دەبەین، ئەو کەوتە پرسیار کردن، کە بۆ وایان لەمن کردووە، ئەوان تەنها ئەوەیان گوت کە لە لێکۆڵینەوەدایە. کەسەکە فەرمانی پێکردن  من ببەنە ژووری ئەو، پاسەوانەکان تەنها بە بەڵێ گەورەم وەڵامی ئەویان دایەوە، تێگەیشتم ئەو کەسە بەرپرسێکی گەورەیە. بردیانمە ژوورەکەی ئەو، داوایکرد دەست و چاوم بکەنەوە، کە چاویان کردمەوە زۆر دیمەنێکی سەرنجڕاکێش بوو، چاوەکانم بەتەواوی هەڵنەدەهاتن، نەمدەزانی چەند رۆژە رووناکیم نەدیوە، بەڵام دەزانم کە ماوەیەکی دوور و درێژە. داوای لێکردم لەسەر کورسییەکەی بەردەم مێزەکەی دانیشم، کەوتە پرسیارکردن:

- تۆ چیا هاوار جەلال بەگی و برازای نیاز دەرگەڵەیی؟

- بەڵێ

تۆزێك وەستا و بێدەنگ بوو.

- گوتی جگەرە دەکێشی؟

- بەڵێ، بەڵام ماوەیەکی زۆرە نەمکێشاوە، چونکە پێیان نەداوم، هەرچەندە نازانم ماوەکەی چەندە، چونکە کاتەکانم لێ تێکەڵ بووە و نازانم لە کەیەوە لێرەم؟!

- ئەو گوتی ئەمڕۆ ١٩ ڕۆژە لێرەی.

کەواتا من نۆزدە ڕۆژە هیچ جۆرە روناکیییێکم نەبینیوە، ئەوەم بەبەرخۆمەوە گوت. بەڵێ نۆزدە ڕۆژە لە ژێرزەمینێکدام بچوکترین روناکی تێدا نەبوو، کە دەیانهێنامە دەرەوەش زۆر بەتوندی چاوەکانیان دەبەستم. ئەو نۆزدە ڕۆژە بەهیچ شێوەیەك شەو و ڕۆژم لەیەك جیانەکردۆتەوە و نەمزانیوە چ کاتێکە، لەخۆمم دەپرسی چ تاوانێکم کردووە، لەکام سەنگەری شەڕدا گیراوم و خۆ بۆمب و ماددەی هۆشبەرم پێ نەگیراوە، تا وام بەسەر بێنن!!.

ئەو بەرپرسە جگەرەیەکی دایە دەستم و داوای لە پاسەوانەکەی کرد چامان بۆ بێنێت، پاکەتەکەی خستە بەردەمم و گوتی دەتوانی بە دڵی خۆت جگەرە بکێشی، دوای نۆزدە ڕۆژ چایەکم خواردەوە، من لە منداڵیەوە زۆر حەزم لە چایە، ئەگەر چەند کاتژمێرێك چا نەخۆمەوە توشی ژانەسەر دەبم، ئەو نۆزدە ڕۆژە بەردەوام ژانەسەرم هەبوو، بەڵام لەتاو ئازاری ئەشکەنجەدانەکە خەیاڵم بۆ ئەوە نەدەچوو، کە ژانەسەرەکەم هی ئەوەیە چام

نەخواردۆتــەوە. ئەویــش دەســتی کــرد بــە تەلەفۆنکــردن، وادیــار بــوو لەگــەڵ لێکۆڵەرەوەکــە قســەی دەکــرد، قســەکانی لەبــارەی منــەوە بــوو، داوای لێکــرد مەلەفــی منــی بــۆ بنێرێــت. نەختێــك بــە گــرژی قســەی لەگــەڵ کــرد و لــە کاتــی قســەکانی گوێــم لێبــوو، گوتــی دەبــێ بەپەلــە بەرێــی بکەیــن بــۆ ئاکــرێ، چونکــە خاچــی ســووری نێــو دەوڵەتــی بەدوایــدا دەگەڕێــت و دەیانــەوێ چاویــان پێــی بکــەوێ. کەوتــە تانــە لێدانــی و گوتــی خاچــی ســوور بەڵگــەی بەدەســتەوەیە، کــە لای ئێمــە دەســتگیر کــراوە، تەلەفزیۆنــەکان بــە بــێ بیرکردنــەوە و پــرس و راوێــژ لەگــەڵ ئێمــە لــە دهــۆك چــوون چاوپێکەوتنیــان لەگــەڵ کــردووە و چاوپێکەوتنەکــە لــە تەلەفزیۆنــی دهــۆك و هەولێــر بــڵاو بۆتــەوە. تێگەیشتم، ئەگــەر ئــەو چاوپێکەوتنــە نەبوایــە رەنگــە بارودۆخــم زۆر لــەوە خراپتــر بوایــە و رەنگــە هــەر بیانکوشــتبام. کــە گوێــم لــەو قســەیە بــوو، نەختێــك ئــارام بوومــەوە و گوتــم مــادام خاچــی ســووری نێودەوڵەتــی بەدوامــدا دەگەڕێــت رزگارم دەبێــت. دواتــر تەلەفۆنێکــی تــری کــرد و داوایکــرد دەســتێك جلــم بــۆ بێنــن. ئــەو گوتــی بــا کــەس بــەو جلانــەوە نەیبینــێ، تــا ئــەو کاتــە مــن ســەرنجی جلەکانــی خــۆم نەدابــوو و نەمدیتبــوو چیــم بەســەر هاتــووە، کــە لەخــۆم ورد بوومــەوە تیشــێرتێکی ســپی و پانتۆڵێکــی رەساســی تۆخــم لەبەردابــوو، بینیــم تــەواوی جــل و بەرگــم خوێنــی پێــوە وشــك بــووە، پێشــتر هەســتم دەکــرد جلەکانــم رەق بــوون لەبەرمــدا، بــەڵام وا تێگەیشــتبووم هــی ئارەقەکردنــەوەی زۆرە. لەکاتــی ئەشــکەنجەدان هەســتمدەکرد هــەر

کێبڵێکی بەرم دەکەوێت شوێنێکم برینـدار دەبێـت و خوێنێکی زۆرم لەبەر دەڕۆیشت. ئەو ڕۆژە ئەو بەرپرسە پێیگوتم کە ئازاد ناکرێم و بەرێمدەکەن بۆ زیندانی ئاگری. ئەو ڕاستگۆیانە لەگەڵم دوا و هیچ هیوایەکی پێنەبەخشیم، لەگەڵ ئەوەشدا زانیم کە لەو زیندانە تاریکەی ژێرزەمینی هەمان بینا ڕزگارم دەبێت. هەرچەندە نەمدەزانی چارەنووسم بەرەو کوێیە و لە ئاگری چیم بەسەر دێت، چونکە پێشینەیەکم دەزانی لەسەر زیندانی ئاگری، بەڵام هێشتا پێموابوو لێرە باشترە. دوای گفتوگۆکانی ئەو بەرپرسە، بەرەو ژوورێکی تر بـرام، دەستێك جلیان پێدام و داوایان لێکردم جلەکانم بگۆڕم، هەر لەو ژوورە خۆم گۆڕی، ئەو بارەگایەش لە بینایەکدا بوو، کە پێشتر هۆتێلێکی گەشتیاری بووە، ژوورەکانی نهۆمی سەرەوە هەموویان وەك یەك بوون، هەر ژوورێك حەمام و تەوالێتی خۆی هەبوو. دوای ئەو ماوە دوور و درێژە ڕوخساری خۆمم لە ئاوێنەی سەر دەستشۆری حەمام و تەوالێتی ژوورەکەدا بینیەوە، قژ و ڕیشم تێکەڵی یەکتر بوبوون، ڕیشێکی تاڵتاڵی تەنك، بەڵام درێژ. جەستەم هێندە لاواز بوو خۆم نەدەناسیەوە، قژ و ڕیشێکی چڵکن و ناڕێك هەمووی بەیەکەوە نووسابوو. نەختێك دەموچاوم شوشت و دەستێکی تەڕم هێنا بە قژمدا، بانگکرام و چوومە دەرەوە، دیسانەوە دەست و چاویان بەستم و خستیانمە پشتی ئۆتۆمبێلێك، ماوەیەکی زۆر کەم ڕۆیشت و وەستا، بردیانمە زیندانێکی تری نزیك لەو شوێنەی، کە نۆزدە ڕۆژ لێی مابوومەوە.

لەنێو حەوشە بچووکەکەی بەشی پێشەوەی خانوەکە دەست و چاویان کردمەوە. ئەو زیندانە لە خانوی مالآن دەچوو، دوو ژوور لەبەشی پێشەوە بوو و بەنێو ژوورێکیاندا بردیانم بۆ هۆڵێکی ناوەڕاستی خانوەکە. دوو ژووری تر لە بەشی پشتەوە لەسەر ئەو هۆڵەدا هەبوو، ئەو دوو ژوورە زۆر بچوك بوون یەکێکیان چوار بە پێنج بوو ئەوەیتریشیان سێ بەچوار. ژوورە گەورەکە زیاتر لە شەست کەسی تێدابوو، ژوورە بچوکەکەش چل و دوو کەس. دەرگای ژوورە بچوکەکە کرایەوە و بردیانمە ئەوێ، کە سەرم هەڵبڕی یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانم لەوێ بوو، ئەو لە رانیە هاوڕێم بوو و لە ئیستانبۆڵیش پێکەوە بووین، من لە ئیستانبۆڵ بووم، کە هەواڵی دەستگیرکرن و سنورداشکردنەوەیانم زانی. هەردووکمان بەدیار یەکەوە حەپەساین، خێرا هێمای بۆ کردم و تێیگەیاندم، کە یەکتری ناناسین. زۆرم بەلاوە سەیر بوو ئەو  بۆ وا دەڵێ و لەچی دەترسێ، بە بێدەنگی لە نزیك دەرگاکە دانیشتم، دەمەویست بزانم لەکوێم، لەکەسێکم پرسی ئێرە کوێیە؟ هیچ وەلآمێکی نەدامەوە، دواتر زانیم ئێرە زیندانی ئاسایشی مەسیف سلاحەدینە. دوای چەند کاتژمێرێك هاوڕێکەم تێیگەیاندم، ئەگەر ئیدارەی زیندان بزانن، کە هاوڕێی یەکین لێکۆڵینەوە لەگەڵ هەردوکمان دەکرێتەوە و ئەشکەنجەی زۆر دەدرێین، بۆئەوەی زانیاری لەسەر یەکتری بدرکێنین. لە راستیشدا وابوو، چونکە ئەوان بەدوای زانیاری زیاتردا دەگەڕان، بۆئەوەی بیکەنە بەڵگەی زیاتر. هەرچەندە

بەندکردنـی  هەریەکێکمـان یاسـایی نەبـوو و هیـچ کاممـان فەرمانـی دادوەرمـان نەبـوو بـۆ بەندکردنمـان و دەمانزانـی ئێمـە لەلایـەن حیزبـەوە دەسـتگیر کراویـن و حیزبیـش زۆر لەسـەرووی یاسـا و ڕێنماییـەکان هەڵسوکەوت دەکات.

لەو زیندانـەدا کەسێکی تەمـەن مـام تاوەنـد لەنێـو هۆڵەکەی بـەردەم دوو ژوورەکە بـوو، تێگەیشتم ئەویش زیندانییە، ئـەو گوزەرانـی لـە ئێمـە باشـتر بـوو، هـەم جێگایەکی فراوانی هەبوو هـەم هاتوچۆکردنی بۆ حەمـام و سـەراو ئـازاد بـوو. پرسـیارم لەیەکێـك لـە زیندانیان کرد، چونکە ئـەو چەنـد ڕۆژێـك پێـش مـن هێنـرابـوو بـۆ ئـەو زیندانـە و گوتـم ئەمـە کێیـە؟ ئـەو گوتـی ئـەوە سـکرتێری یەکێـك لـە حزبـە تورکمانەکانـی کوردسـتانە و خۆیشـی نازانـێ لەسـەر چـی گیـراوە و دەڵێ سێ مانگـە دەسـتگیر کـراوم. سێ ڕۆژ لـەو زیندانـە تەنگەبـەرە لەنێـو گەرمایەکـی پڕوکێنـەردا ماینـەوە، تەنهـا شـتێکی بـاش ئـەوە بـوو دوای ماوەیەکـی دوور و درێـژ دووجـار توانیـم حەمـام بکـەم و لـە بۆنـی ناخۆشـی ئارەقـە وخوێـن، کـە لەجەسـتەم دەهـات ڕزگارم بێـت. هەرچەنـدە حەمـام و سـەراویش کاتـی بـۆ دیاریکرابـوو و ئـازاد نەبوویـن لـەوەی بتوانیـن بەباشـی خۆمانـی تێـدا پـاك بکەینـەوە، بـەڵام بـۆ مـن زۆر گرنـگ و سـود بەخـش بـوو.

شـەوی سـێیەم ئـاگادار کراینـەوە، کـە بەیانـی وەجبەیەك لـە زیندانیان دەگوازرێنەوە، بۆیە بەیانی دەبێ زوو لە خەو هەڵسن، من نەمدەزانی بۆ کوێ دەگوازرێینـەوە، یەکێـك لـە زیندانیـان چرپانـدی بەگوێمـدا و

گوتی هەمووومان دەبەن بۆ زیندانی ئاکرێ. زیندانی ئاکرێ یەکێک بوو لە زیندانە مەترسیدارە بەناوبانگەکانی ئەوکاتی کوردستان و بۆ زیندانیانی شەڕی ناوخۆ دروستکرابوو، زانیارییەکانی لەوێوە دەهاتن باسیان لەوە دەکرد، کە یەکێکە لەزیندانە رەشەکان و زۆرترین ئەشکەنجەی تێدا دەدرێ، بەشێوەیەك بیستبوومان کە چەندین کەس لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان لەدەستداوە یان کەم ئەندام بوون. ئەوانەی لەو زیندانە ئازاد بووبوون بیستبومان، کە لەبارودۆخێکی دەروونی و تەندروستی ناهەمواردان و بە ئاسانی ئاسەواری ئەو ئەشکەنجە جەستەیی و دەروونییەیان ناسڕێتەوە. هەرچەندە رزگار بوونیش لەو زیندانە زۆر کەم و دەگمەن بوو، بەڵام جار جارە کەسێك بە شێوەی گۆڕینەوە ئازاد دەکرا و لەسەر زاری ئەوانەوە زانیارییەکانی نێو زیندانی ئاکرێ ئاشکرا دەبوون. رۆژی دواتر، کاتژمێر پێنجی بەیانی خەبەرکراینەوە و سواری دوو پاسی تایبەتیان کردین، لەنێو ئەو پاسانەدا بەهیچ شێوەیەك دیمەنەکانی دەرەوە دیار نەبوون، پاسەوانێك لەنێو پاسەکەدابوو، ئەو نەیدەهێشت هیچ زیندانییەك سەیری یەکتری بکات و گفتوگۆ پێکەوە بکەن، بۆیە بەشێك خەوتن و ئەوەی تریش دەبوایە سەیری بەردەم خۆی بکات و بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ خۆیدا. من یەکێك بووم لەو کەسانەی بە درێژایی سێ کاتژمێر لە بیرکردنەوەدابووم، دیسانەوە خەیاڵم رۆیشتەوە سەر ژیانی پێش سەفەر و کارەساتەکانی بەسەرم هاتن، بیرم لای قسەکانی باپیرم

بوو، بەشێکیان هاتبوونەدی، تەنها لە رووی فیزیکیەوە رۆح لەنێو جەستەمدا بوو. لەنێو پاسەکە بیرم لە رووداوەکەی دەریای ئیجە دەکردەوە، ئەو شەوە هێندە هەوڵمدا خۆم رزگار بکەم بۆئەوەی چیرۆکی مەترسیدارتر ببینم؟! دەمگوت خۆ دەریای ئیجە بەو هەموو بێ بەزەییەی خۆیەوە نەیخنکاندم، بەڵام پێدەچێ زیندانی ئاکرێ بمخنکێنی! بیرم لای هاوڕێکانی ترم بوو، هەریەکە و بە تۆمەتێک گیرابوون، هەموویان وەك من ترس دایگرتبوون، هیچ کاممان تەنها هیوایەکمان نەبوو و ئەوەی بیرمان لێ دەکردەوە ژیانە نوێیەکەمانە، ئاخر ئەو ژیانە نوێیە روونە و دەزانین رووبەڕوی چی دەبینەوە و ئێستا بەرەو چ دۆزەخێك بەڕێوەین.
هێشتا کەسمان زیندانی ئاکرێمان نەدیوە، بەڵام هەریەکە و چەند چیرۆکێکی لەسەر زیندانی ئاکرێ بیستوە و لە ئەندێشەیدایە.
نێو پاسەکە کشومات بوو، هەرچەندە زۆر گەرم بوو، بەڵام نە کەس گلەیی لە گەرمی کەش و هەوا هەبوو نەکەسیش بە هێمایەك باسی کرد، کەس خەیاڵی لای گەرما نەبوو، بەڵکو بیرمان لای چارەنووس بوو لە زیندانی ئاکرێ. ئاخر ترسەکە زۆر لەوە گەورەتر بوو، بۆیە کەس خەیاڵی لەنێو پاسەکەدا نەبوو تا بزانێ گەرمە یان فێنك، هەمووی بە خەیاڵ لە ئاکرێ بوو و وێنای ژیانی خۆماندەکرد لەو زیندانە.
دوای سێ کاتژمێر گەیشتینە نێو حەوشەی زیندانی ئاکرێ، ماوەیەکی باش نەیانهێشت کەس لەپاسەکان دابەزێت، هەموو

گیانمان نوقمی ئارەقە بوو، تێکڕای جامەکانی پاسەکە داخرابوون و دەرگاکەش هەر نەکرایەوە، لە جامی پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکەوە دەرەوەمان دەبینی. دەمانبینی پاسەوانەکان هەریەکە و دارێکی گەورە یان کێبڵ و قامچییان بەدەستەوەیە و بەرەو پاسەکە دێن، دیار بوو چاوەڕوانی ئەوە بوون تا تەواوی پاسەوانەکان کۆدەبنەوە، ئینجا دامانبەزێنن. دوای ماوەیەکی دوورو درێژ دەرگای پاسی ئێمە کرایەوە، گوتیان کەس لە شوێنی خۆی نەجوڵێ تا پێتان دەڵێین. یەکەم کەسیان دابەزاند و ئیتر کارەساتەکە لەگەڵ دابەزینی ئەو کەسە دەستی پێکرد، دوای بیست خولەکێك کەسێکی تریان بە هەمان شێوە دابەزاند. لە راستیدا گوێبیستی لێدان و ئەشکەنجە دەبووین، بەڵام نەماندەزانی چۆنە و چی روودەدات، چونکە هیچمان لێ دیار نەبوو، بەڵام ترسێکی زۆر دایگرتین و بەتەواوی ئەو ترسە هەموومانی تاساندبوو. پێنجەم کەس منیان دابەزاند، بینیم پاسەوانەکان بە ڕیز وەستابوون، لەیەکەم کەسەوە ئەشکەنجە دەستی پێکرد، بە تێکڕای پاسەوانەکان کەوتنە گیانم، بە کێبڵ و قامچی و دار و بۆکس و زللە و شەق تێهەڵدان لە نێوان خۆیان هێنایانم و بردیانم، تا توانای وەستانم نەما، ئەو ئەشکەنجەیە زیاتر لە پانزە خولەکی خایاند. دوای ئەشکەنجەیەکی زۆر بەرەو هۆڵی سێی ئەو زیندانەیان بردم و بە تێهەڵدان فڕێیاندایە ژوورەوە، ئەو کاتەی ئێمەیان بردە ژوورەوە، لەگەڵ قاچمان خستە ئەودیو دەرگا، کەسێك لە زیندانییەکان لەنێو دەرگا وەستابوو و بە هەموو

هێـزی خـۆی سـەرو زللەیەکـی لێدایـن، زۆر بەلامـەوە سـەیر بـوو! چونکـە ئەویـش وەك ئێمـە زیندانییـە ئـەی بۆچـی لـە ئێمەیـدا؟! لـە دڵـم دەرنـەدەچـوو و هێنـدەی لێدانـەکـەی دەرەوە خەفەتـم پێدەخوارد، بـەڵام دوای چەنـد خولەکێـك زانیـم، کـە ئـەوە چاودێـری ژوورەکەیـە. چاودێـر لـە زیندانـی ئاگـرێ وەکـو ئیمـە زیندانـی بـوو و هێنـدەی بەرپرسـی پاسـەوانەکان لەنێـو هۆڵ دەسـەڵاتی هەبـوو، ئـەو کەسـەی دەکرایـە چاودێـر دەبوایـە جێـی متمانـەی ئیـدارەی زینـدان بێـت و ئەوانیـش پاڵپشـتی تەواویـان دەکـرد، هەرچـی بڕیـار و ڕێنماییـش هەبـوو لەڕێـی چاودێـرەوە دەدرایـە زیندانیـان و چاودێریـش سـکاڵای لـەهەر زیندانییـەك بکردایـە چارەنووسـی ڕەش دەکـرد.

دوای ئـەوەی شـوێنی دانیشـتنم بـۆ دیاریکـرا و خێـرا کەوتمـە سـەیرکردنی هۆڵەکـە و زیندانیـان، بـەڵام کـەس سـەیری ئێمـەی نەدەکـرد و هەمـووان ڕویـان لـە دیـوار کردبـوو، هۆڵەکـە تـا ڕادەیـەك گاورە بـوو، بـە چـوار ڕیـز خەڵك دانیشـتوون، هەموویان چوار مەشـقی و ڕوویـان لـە دیـوارە و کـەس سـەری هەڵنابـڕێ. چاودێـری ژوورەکـە بـە دەنگێکـی بـەرز هـاواری کـرد و گوتـی قسـە لەگـەڵ هیـچ کەسـێك نەکـەن. تـا ماوەیەکـی زۆر ئـەو ڕۆژە گوێبیسـتی ئەشـکەنجەدانی هاوڕێیانـم بـووم و هەمویـان بەهەمـان شـێوەی مـن پێشوازییان لێکـرا و دابەشـی سـەر هۆڵـەکان کـران. کـە ئەشـکەنجە و دابەشـکارییەکە تـەواو بـوو، چاودێـری ژوورەکـە چەنـد قسـەیەکی کـرد و گوتـی هیـچ کەسـێك بـۆی نییـە لەگـەڵ ئەوانـەی تـازە هاتـوون قسـە بکـەن و

ئەوانیش بۆیان نییە تا ئاگاداریان دەکەینەوە قسە لەگەڵ هیچ کەسێك بکەن. دوای ئەو قسانە جموجوڵ لەنێو هۆڵەکە دەستی پێکرد، هەموو چاوەکانی هۆڵەکە لەسەر ئێمە بوون، هەموویان بە ئەسەفەوە لێیان دەڕوانین و هاوخەمی و پەژارەی خۆیان نیشان دەداین و بە هەر شێوەیەك بێت پێیان دەگوتین، کە خۆڕاگر بین و ئەوەش تێدەپەڕێ. لە ژێر دیوارێك لە بەشی خوارەوەی هۆڵەکە شوێنم بۆ دیاری کرابوو، چاودێرەکە هات و گوتی بستێك و چوار پەنجە جێگای تۆیە. دەستی چەپم کەسێك بوو و دەستی راستیشم چەند دەبەیەکی ئاوی لێبوو، دیار بوو ئەو شوێنەی منی لێبووم لەتەنیشت سەکۆی شوشتنی قاپەکان بوو. هەرچەند چاوم گێڕا تەوالێتم نەبینی، بۆشم نەبوو پرسیار بکەم. چاودێرەکە قاپێکی فافۆن و کەوچکێکی پێدام، بەڵام کەوچکەکە دەسکی شکاو بوو. کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ هات، دەرگا کرایەوە و هەموو بە ریز وەستان بۆ وەرگرتنی خواردن، سێ کەس دوو مەنجەڵی گەورەیان هەڵگرتبوو، من نەمدەویست خواردنەکە وەربگرم، چاودێرەکە هات و گوتی بۆ هەڵناستی خواردنەکەت وەربگری، گوتم برسیم نییە، گوتی خێرا هەستە ئەگینا بە تۆمەتی مانگرتن بۆت حساب دەکرێ، بۆیە هەستام و قاپە فافۆنە رەشەکەم گرت بەدەستەوە و سەیری زیندانییەکانی ترم کرد، کە چۆن خواردن وەردەگرن و منیش بە هەمان شێوەی ئەوان قاپەکەم بۆ راگرتن و نەختێك برنج و چەند دەنکێك فاسۆلیایان کرد بەسەریدا، لە ترسی

ئـەوەی تۆمەتـی مانگرتنـم نەخرێتـە پـاڵ، چەنـد کەوچکێکـم لـە چێشتەکە خوارد و دەستم هەڵگرت. لەکاتی نانخواردنـدا سەرنجمدا کەوچکی هەمـوو زیندانیـان دەسکەکەی شکابوو، دواتـر تێگەیشتم، کە تەنانـەت دەسکی کەوچکیش قەدەغەیـە لەبـەر ئـەوەی نەتوانـن دەسکەکەی تیـژ بکـەن هاوشـێوەی چەقـۆ، ئـەوەش زیاتـر لـە ترسی هەوڵـی خۆکوشـتن بـوو. هەمـوو گیانـم کوترابـوو، هەسـتم بـە ئازارێکـی زۆر دەکـرد، دەمزانـی زۆرێـك لـە جەسـتەم ئاوسـاوە، بەتـەواوی هەستم بـە ئاوسانی روخسارم دەکـرد، چونکـە هێندەیـان کێشابوو بـە روخسارمدا دەترسام گوێ یـان چاوم لەدەستبدەم. دوای نانخواردن پاڵکەوتـم، سـەیری دیـوارە بڵنـد و رەشـەکەی ژوورەکەمانـم دەکـرد، دەیـان کیسە و جانتـای زیندانیـان بە دیوارەوە هەڵواسـرابوون، کـە پـڕ بـوون لـە جلوبـەرگ و پێداویسـتی رۆژانەیـان. دیمەنێکـی سـەرنجڕاکێش بـوو، سـەد و شەسـت کـەس لـە هۆڵەکەدا بـوون، بـەڵام کـش و مـات وەك ئـەوەی کەسـی لـێ نەبێـت. ئـەوەش بۆمـن جێـی تێڕامـان بـوو، هـەر کەسـێك قسـەی لەگـەڵ یـەك دەکـرد زۆر بـە هێواشـی و بـە هیـچ شـێوەیەك دەنگـی بـەرز نەدەکـردەوە، هەمـووی بێـزاری بـە رووخساریەوە دیـار بـوو، گەرمـاش تینـی بـۆ هەمـووی هێنابـوو. هۆڵێکی ئـاوا سـەد و شەسـت کەسـی تـێ خزێنرابـوو، یـەك فێنککـەرەوەی بچـوك لـە نێـو پەنجەرەکەدابـوو، کـە رۆژی جارێـك ئـاوی تێدەکـرا. بـە قوڵـی چووبومـە نێـو بیرکردنـەوە و جارجـارەش ئـازاری جەسـتەم بیرکردنەوەکانمی دەپچڕانـد. دەمـەو عەسـر گوێـم

لە دەنگی پاسەوانێك بوو و بە چاودێرەکەی گوت سەرو ریشی میوانە تازەکانت بتاشە، چاودێر بە دەنگێکی بەرز بانگی کەسێکی کرد، کە سەرتاشی ژوورەکە بوو، گوتی یەکە یەکە سەریان بۆ بتاشە. یەکەم کەس بانگی منی کرد و دەستی کرد بە سەرتاشینم، بە دەنگێکی زۆر هێواش گوتی نامناسیتەوە؟ ویستم سەر هەڵبڕم و سەیری بکەم گوتی مەجوڵێ دواتر قسەت لەگەڵ دەکەم. سەرو ریشم سفر کرا و نێردرامەوە شوێنی خۆم. رۆژی یەکەممە لەو زیندانە بەڵام زۆر سەخت، هەموو گیانم ئازاری هەیەو و نە دەتوانم پرسیارێك لە کەسێك بکەم و نە کەسیش بۆی هەیە لێم بپرسێ. دوو کەس لە تەنیشتمەوە دانیشتبوون، بە هێواشی لەگەڵ یەکتری قسەیان دەکرد، بەڵام وا قسەیان دەکرد، کە من گوێم لێبێت، لالۆ بە بەهمەنی دەگوت جەرگم دێشێ بۆ ئەو کوڕە گەنجە، ئازاری زۆرە و تەنانەت ناتوانین دڵیشی بدەینەوە، بەهمەن گوتی چی بکەین تا چل و هەشت کاتژمێر ناتوانین قسەی لەگەڵ بکەین. لالۆ گوتی چەند جگەرەیەکم پێچاوەتەوە و لەگەڵ چەرخەکە لای دەبە ئاوەکە دامناوە، ئەگەر جگەرەکێش بێت دەتوانێ بچێ رێگەپێدان لە چاودێرەکە وەرگرێت و ئەو جگەرانە بکێشێت. ئەو قسەیەی لالۆ بۆ من زۆر باش بوو، ویستم بچم بۆلای چاودێرەکە، بەڵام لەبەر خۆمەوە گوتم با پەلە نەکەم. ئەوان تێکڕای گفتوگۆکانیان تەرخانکردبوو بۆئەوەی من لە بارودۆخی ئەوێ ئاگاداربم، چاودێر هاتە نزیك ئێمە، منیش

هێمایەکم بۆی کرد و گوتم دەتوانم جگەرە بکێشم؟ چاودێرەکە گوتی بۆ جگەرەت پێیە؟ گوتم نەخێر، بەڵام وا خەریکە روحم دەردەچێ بۆ جگەرە، لالۆ یەکسەر بە چاودێرەکەی گوت ئەگەر رازی بیت دەتوانم جگەرەی بدەمێ، چەند کەسێکی تر پاکەت و جگەرەیان دەرهێنا و بۆ چاودێرەکەیان برد. چاودێر پاکەتێکی لەیەکێک وەرگرت و دایە دەستم، بەڵام بۆ ئەوەی لالۆ تێبگەیەنم و سوپاسی بکەم، دەستم برد بۆ ئەو جگەرانەی ئەو بۆی دانابووم و ئەوانەم کێشا. لالۆ خەڵکی ناوچەی گەرمیان بوو، تەمەنی نزیک بە پەنجا ساڵان بوو و لە یەکێک لەشەڕەکان بە برینداری دەستگیر کرابوو، بەردەوام بە ئازاری برینەکەیەوە دەیناڵاند و هەمیشە نەخۆش بوو، بەهەمەنیش خەڵکی شاری سلێمانی بوو و لەنێو شاری هەولێر دەستگیر کرابوو، ئەو نەیدەزانی بۆ گیراوە، وەك خۆی باسی دەکرد لە هەموو بنەماڵەکەیان کەسێکیان تێدانییە سیاسی بێت یان سەر بە حزبێك بێت، بەڵکو بنەماڵەکەیان سەرقاڵی کاسبین و کاری دوکانداری دەکەن.

ئێوارە دوای نانخواردن جارێکی تر دەرگا کرایەوە و بانگی من کرا، سێ کەس لە پاسەوانەکان لەپشتی دەرگاکەوە بەگیریان هێنام بە پرسیارکردن، پرسیاری یەك بەیەکی کەسوکارەکەمیان دەکرد. زۆر بەلامەوە سەیر بوو ئەوانە بۆ هەموو کەسوکاری من دەناسن! کە پرسیارەکانیان تەواو بوو و وەك ئەوەی تازە لە پاسەکە دابەزیبم و ئەوانیش تینوی ئەشکەنجەدانی من بن، بە تێلا و شەق و زللە

کەوتنە گیانم و بە ئەندازەی پێش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ لێیاندام و هەڵیاندامەوە ژووری٠ پێدەچوو ڕاپۆرتێکی زۆر ورد لەسەر من و کەسوکارەکەم درابێتە ئەوان، بۆیە وا هەموو شتێك لەبارەی خۆم و بنەماڵەکەشمەوە دەزانن٠ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو دەرگا کرایەوە و گوتیان بڕۆن بۆ نێو حەوشە بۆ پیاسەکردن، کۆڵێك دڵم خۆشبوو، دەبوایە بچینە نێو حەوشە و پیاسەمان بکردایە تا نۆبەتی سەراومان بەر دەکەوێت، بەڵام بەدرێژایی ئەو کاتە هەر لە چوونە دەرەوەمان دەستمان لەپشتەوە بگرتایە تا دەچووینەوە ژوورەوە، ئەو ڕۆژەش ڕۆژێکی تاڵ بوو، کاتی چوونە ژوورەوەمان پاسەوانەکان وەستابوون دەبوایە یەك دوای یەك ژمارەمان گوتبا، ئەوەی پێش من چ ژمارەیەك بوایە دەبوایە من ژمارەی دوای ئەو بڵێم٠ یەکەم کەس کە گوتی یەك، کەوتنە گیانی بە چەند کەسێك لێیاندا، ئیتر هەموومان تێهەڵدانێکی زۆرمان خوارد و چوینەوە ژوورەوە٠ دوای نانی بەیانی، لالۆ و بەهمەن کەوتنەوە قسەکردن، بەهمەن بە لالۆی گوت لێدانی ئەمڕۆ چی بوو؟ لالۆ گوتی خۆت نازانی هەر وەجبەیەکی تازە دێنن بارودۆخەکە ئاوای لێدێتەوە٠ ئەوە بۆ چاو شکاندنی میوانە تازەکانە و دەیانەوێ پێیان بڵێن کە ئێرە چۆنە، لەو گفتوگۆیە تێگەیشتم، کە لێدانی دوێنێش هەر بۆ ئەوە بووە، کە ترسی زیندانی ئاکرێمان پێ بناسێنن و ئەوەی ئەمڕۆش هەر بۆ ئەوە بووە٠
دوای چل و هەشت کاتژمێر، چاودێری ژوورەکە بانگی کردم و

گوتی دەتوانی تێکەڵاوی زیندانیان بیت، بەڵام ئاگاداربە بۆت نیە باسی چۆنیەتی گیران و هیچ چیرۆکێکی ژیانی خۆت بکەیت، باسکردنی سیاسەت قبوڵ ناکرێت، پاسەوانەکان بزانن باسی سیاسەت دەکەیت ژووری سیانزە فادرمەکەت نیشان دەدەن! دوای دوو سێ ڕۆژی تر هاوڕێیەك بۆخۆت بدۆزەوە کە بەیەکەوە نان بخۆن، چونکە بۆت نیە بەتەنیا نان بخۆیت. کۆمەڵێك ڕێنمایی تری پێدام و چومەوە سەر شوێنی خۆم. ئەو ڕۆژە بە تاسەوە چاوەڕوانی سەرتاشەکە بووم کە بیناسمەوە ئاخۆ کێیە، بەڵام زوو لالۆ و بەهمەن ئاگاداریان کردمەوە کە وریابم و هیچ کەس ناوێرێت زوو هاوڕێیەتیتان بکات، چونکە دەکەونە ژێر پرسیار و لەکاتی لێکۆڵینەوە ئازاری هەردووکتان دەدەن بۆ ئەوەی زانیاری لەسەر یەك بدرکێنن. قسەکەی هاوڕێکەم بیر کەوتەوە لە زیندانی ئاسایشی مەسیف سەلاحەدین، کە هەمان شتی پێگوتم، بۆیە هەڵوەستەیەکم کرد و تا چەند ڕۆژێك لەگەڵ زۆربەی زیندانیان تەنها سڵاومان لەیەکتری دەکرد. پرسیارم لە لالۆ کرد و گوتم سەرتاشەکە خەڵکی کوێیە، ئەو گوتی خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتییە. گومانم نەما، کە بەباشی یەکتری دەناسین. دوای چەند ڕۆژێك سەرتاشەکە هات بۆ لای لالۆ، بەهۆی لالۆوە کەوتینە گفتوگۆ و بە باشی یەکترمان ناسیەوە، ئەو ماڵیان لە کۆمەڵگای (پیرزین) بوو و دراوسێی ماڵی پورم بوو، زۆر باش یەکتریمان دەناسی، بە تۆمەتی ئەندام بوونی لە یەکێتیدا دەستگیر کرابوو

و چەنـد مانگێـك بـەر لـە مـن هێنابویانـە زیندانـی ئاگـرێ، دوای ماوەیـەك لەگـەڵ ئـەو خوانەکەمـان تێکـەڵ کـرد.

ڕۆژەکانـی ئاگـرێ بـە سـەختی و ناخۆشـی ئێجگار زۆر تێدەپەڕیـن، هەفتانـە چەندیـن زیندانـی تـر دەهێنرانـە ئـەوێ، بارودۆخ ڕۆژ بەڕۆژ سـەختتر و ناخۆشـتر دەبـوو، ئەشـکەنجەی جەسـتەیی و دەرونـی تـا دەهـات توندتـر و بێزارکەرتـر دەبـوون، ژوورەکان جێگایـان نەبـوو بـەڵام بـەزۆر زیندانیـی تریـان تـێ دەخزانـد، وەك ڕسـتەی ماسـی دەبوایـە لەسـەر لا بخەویـن، مـن سـەرم دەکەوتـە لای قاچـی یەکێـك و ئەویـش سـەری دەکەوتـە لای قاچەکانـی مـن. دەبوایـە کاتژمێـر ١٠ی شـەو هەمـوو زیندانیـەکان پاڵکەوتبـان و چاویشمان دابخەیـن، بەهیـچ شـێوەیەك دوای ئەوکاتـە بـۆت نەبـوو هیـچ قسـەیەك بکەیـت.

گومـان لـەوەدا نیـە، کـە زیندانـی ئاگـرێ یەکێـك بـوو لـە ترسـناکترین زیندانەکانـی کوردسـتان و ڕەنگـە لەناوچەکەشـدا هاوتـای ئـەو زیندانـە کـەم بـن، چونکـە شـێوازی بەڕێوەبـردن و ئەشـکەنجەدان و ئاراسـتەکردنی زیندانیـان لـەو چیـرۆك و ڕۆمانـە ئەفسـانەییانە دەچـوو، کـە پێشـتر کـەم تـا زۆر خوێندومانەتـەوە.

ژیـان تـا بڵێـی سـەخت و دژوار بـوو، هیـچ کاتێـك و هیـچ کەسـێك هەسـتی بـە مرۆڤبـوون نەدەکـرد، شـێوازی ژیـان جیاوازییەکی ئێجگار زۆری هەبـوو لەگـەڵ ژیانـی دەرەوە. کۆمەڵێك یاسا هەبـوون مـن هیچ کاتێك نەمزانیبـوون، بەتایبەتـی لەسـەر ژیانـی ئاسایی نێـو زینـدان. خەوتـن کاتژمێـری بـۆ دیـاری کرابـوو و خواردنیـش بەپێـی ئـەو

سیستەمە بوو، کە خۆیان دیاریان کردبوو. دەبوایە کاتژمێر١٠ی شەو هەموو کەسێك لەسەر جێی خۆی بوایە و خەوتبا، لەکاتی خەتنیشدا بەبەردەوامی دوو کەس لە نێو هۆڵەکە وەك پاسەوان چاودێری زیندانیانیان دەکرد، هیچ کەسێك بۆی نەبوو بەبێ پرسی ئەو دوو کەسە هیچ جموجوڵ و قسەیەکیش بکات. سەری هەموو کاتژمێرێك ئێشکگرەکان دەگۆڕان، ئێشکگرەکان هەر زیندانی بوون و ئێواران چاودێری هۆڵەکە لیستی ئێشکگری دیاری دەکرد. لای دەرگای چوونەدەرەوە سیفۆنێکی هەڵواسراوی تەوالێت هەبوو، بۆ سەراوکردنی بچوك سودی لێ وەردەگیرا، شەوانە هەرکەسێك پێویستی پێ بوایە دەبوایە پرس بە ئێشکگرەکان بکات تا بتوانێت دەست بە ئاو بگەیەنێت، خۆ ئەگەر پێویستی بە سەراوی گەورە بوایە هیچ کاتێك دەرگا نەدەکرایەوە و دەبوایە دوو کەس لەپشتی دەرگاکەوە بەتانییێکیان بگرتایەوە و کەسەکە سودی لە زەرفی عەلاگە وەرگرتبا. تەنها بەیانیان و ئێواران دەرگا دەکرایەوە بۆ تەوالێت، ئەویش چاودێر دادەنرا و تا ژمارە دەی دەژمارد دەبوایە لەو ماوە کورتەدا بهاتینایە دەرەوە، ئەگینا چاودێر شەقێکی لەدەرگاکە هەڵدەدا و بەر دەموچاومان دەکەوت. هۆڵەکەی ئێمە کە ١٦٠ کەسی تێدابوو، دەبوایە لەماوەی ٢٠ خولەکدا سودمان لە شەش تەوالێت وەرگرتبا و بگەڕێینەوە ژوورەوە، زۆر جاریش بەشێك لە زیندانیان نۆبەتیان نەدەگەیشتێ و دەخرانەوە ژوورەوە.

بەیانیان دوای چونەوە ژوورەوەمان راستەوخۆ خواردنی بەیانی

دابەشدەکرا، زۆربەی کات بۆ هەر یەك کەس قاپێك نیسکێنە یان نۆکاو و دوو سەمونمان پێدەدرا٠ هیچ کەسێك بۆی نەبوو داوای خواردنی زیادە بکات، خۆ ئەگەر یەك سەمونی زیاد یان خواردنی نەفەرێك زیادەت وەرگرتبا، ئەوا سزایەکی قورس چاوەڕێی دەکردی٠ نیوەڕۆیان لە ڕۆژی هەینییەوە تا پێنج شەممە برنج و شلەیان پێدەداین، هاوینان شلەی سلقاو یان باینجان، زستانانیش شلەی فاسۆلیا٠ پێنجشەممان ساوەر و شلە و گۆشتیان پێدەداین، هەفتەیەك گۆشتی سوور و هەفتەیەکیش مریشك٠ بەدرێژایی ئەو ماوەیەی لە زیندان بووم تەنها بۆ جارێك نەمبینی خواردنێکی باشمان پێ بدەن، خواردنەکان یان زۆر سوێر و نەکولاو بوو یان ئەگەر باش بوایە بۆنی نەوتی لێدەهات، پێدەچوو بەدەستی ئەنقەست وامان لێ بکەن، چونکە بەدرێژایی ئەو ساڵە بۆ جارێك بەرێکەوتیش نەمبینی فاسۆلیا و نۆك و گۆشتی تەواو کولاومان بدەنێ٠ جگە لەوەش هێندەیان سوێر دەکرد، ئەگەر ناچاری نەبوایە کەم کەس دەیتوانی بیخوات٠ بەدرێژایی ئەو ماوەیە و پێش ئێمەش هیچ کاتێك سەوزە و میوە بە زیندانیان نەدەدرا، خۆمان هەندێکجار خەیار و تەماتە و پیازمان دەکڕی، بەڵام ئەوەش بەردەوام لەبەردەستدا نەبوو، هەندێکجاریش لەکاتی هاتنی کەسوکارمان میوەیان بۆ دەهێناین٠ لە حانوتی زیندانیش کۆکا کۆلایەکی شوشە کە، لە بازاڕەکانی کوردستان بەخراپترین شێوە بەرهەم دەهێنرا لەگەڵ پسکێتێك بە نرخی پێنج دیناری

سویسری دەفرۆشرا، کە نرخەکەی پێنج ئەوەندەی نرخی خۆی بوو، لەبەر ئەوەی پارەشمان نەبوو لە مانگێکدا رەنگە هەر جارێك بمانتوانیبا کۆکا کۆلایەك و پسکیتێکی ماوە بەسەرچوو بکڕین.

ئێوارەیەك بانگیانکردمە دەرەوە، لەنێو حەوشەکەدا بەڕێوەبەری زیندان ڕاوەستا بوو لەگەڵ چەند پاسەوانێك. گوتی چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشم لەسەر تۆ بیستووە، دەڵێن تۆ یەکێکی لە دەربازبووانی ئەو بەلەمەی لە دەریای ئیجە نوقوم بووە، ئادەی بۆم باس بکە بزانم چۆن بوو. ئەو کەوتە پرسیارکردن و منیش بەسەرهاتەکەم گێڕایەوە، هەستمکرد هیچ نیگەران نییە بە زانینی ئەو مەرگەساتە، زۆر ئاسایی گوێی گرتبوو. ڕۆژنامەیەکی بەدەستەوە بوو گوتی لەو ڕۆژنامەیە وتارێك نووسراوە لەسەر ئێوە پێتی دەدەم بیخوێنەوە، ڕۆژنامەکەی پێدام و گوتی بیبەنەوە ژووری، کە نزیکی دەرگا بووم بێ هیچ هۆکارێك کەوتنە گیانم و تا توانایان هەبوو بە چوار کەس لێیاندام و فڕێیاندامە ژوورەوە. تێگەیشتم، کە بەڕێوەبەر فەرمانی پێکردوون. دواتر چاودێرەکە پێی گوتم بەڕێوەبەر بانگی هەر کەسێك بکات دواتر لێی دەدەن بۆئەوەی وانەزانێت، کە بەڕێوەبەر ڕێزی دەگرێت جگە لەو کەسانەی جاسوسی بۆ ئەوان دەکەن ڕێز لەوان دەگرن و لێیان نادەن. هاتمەوە ژوورەوە و تاقەتی هیچ شتێکم نەبوو، تەنانەت حەزم بە خوێندنەوەی ئەو وتارەش نەبوو، کە لەڕۆژنامەکەدا لەسەر ئێمە نووسرابوو و بەبێدەنگی لەسەر جێی خۆم دانیشتم.

لەوکاتانـەدا هیـچ کەسێك ناوێـرێ لێت نزیـك بێتـەوە یـان قسـەیەکت لەگـەڵ بـکات، چونکـە سیسـتمەکە وابـوو دوور نەبـوو ئەویـش ببەنـە دەرەوە و بـەدەردی منـی ببـەن. ڕۆژی دواتـر لاپەڕەکانـی ڕۆژنامەکـەم هەڵدایـەوە، وتارێـك لـە لەژێـر نـاوی (تراژیدیـای دەریـای ئیجـە) بـڵاو کرابـۆوە، لـە وتارەکـەدا زۆر ڕۆمانسیانە بـاس لـە ڕزگاربوونـی ئێمـە کرابـوو، ئێمەیـان وەك پاڵـەوان نیشاندابوو، کـە دەریایەکـی بـێ بەزەیـی وەك دەریـای ئیجـە نەیتوانیـوە گیانمـان بکێشـێت و خۆڕاگـر بوویـن لەبەرامبـەر شـەپۆلە بـێ بەزەییەکانیـدا. دوای خوێندنـەوەی وتارەکـە خەیـاڵ جارێکـی تـر بردمیەوە، ئاخر نووسـەر دەبـێ ئاگاداری بارودۆخـی ئێسـتای ئـەو کەسـە بێـت، کـە یەکێکـە لـەو کەسـانەی ئـەو بـە پاڵـەوان نـاوی بـردوون، ئایـا دەزانـێ ئـەو حزبـەی خاوەنـی ئـەو ڕۆژنامەیـەی تراژیدیـای ئێمـەی بـڵاو کردۆتـەوە و بـە پاڵـەوان نـاوی بردوویـن ئێسـتا سـەرقاڵی ئەشـکەنجەدانی پاڵەوانەکـەن؟!.

دوای دوو مانـگ لـە بەسـەربردنی ژیانێکـی پـڕ لـە ئـازار و مەینەتـی و بـێ ئـەوەی هیـچ هەواڵێکـی کەسـوکارم هەبێـت و ئەوانیـش هەواڵـی منیـان هەبێـت، بـۆ یەکەمجـار لەنجـەی خوشـکم و محەمـەد عەلـی هاوسـەری و چەنـد خزمێکـم هاتـن بـۆ سـەردانم، لـە ڕێـی ئەوانـەوە هەواڵـی سـەلامەتی کەسـوکارم پێگەیشـت. ئـەوان تەنهـا توانیـان ئـەوە بڵێـن، کـە هەمـوو لایـەك لـە هەوڵـی ئـازاد کردنمـدان، نەیانتوانـی هیچـی تـر بڵێـن، چونکـە پاسـەوانێك لـە نێوانمان دانیشـت و چاودێری گفتوگۆکانـی ئێمـەی دەکـرد. تێکـڕای چاوپێکەوتنەکـەم لەگـەڵ

کەسوکارم تەنها حەوت خولەکی خایاند و ماڵئاواییمان لەیەکتری کرد. ئەو سەردانەی کەسوکارم نەختێك ئارامیی پێبەخشیم، چونکە هەم من دڵنیابووم لە سەلامەتی کەسوکارم و هەمیش ئەوان ئاگاداری مان و نەمانی من بوون. لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێك پێداویستیان بۆ هێنابووم وەك پارە و جلوبەرگ و خواردن و جگەرە. پێش ئەو سەردانەی لەنجەی خوشکم و هاوسەرەکەی هیچ شتێکم لا نەبوو، تەنانەت پارەی چایەك و پاکەتێك جگەرەشم نەبوو، چونکە لە ئاسایشی گشتی هەولێر ئەو شتانەی پێم بوو هەموویان لێ سەندم، کە بڕێکی زۆر پارە و چەند ڕۆژنامەیەکی تورکی کە تێکڕایان هەواڵی ڕزگاربوونی ئێمەیان تێدا بڵاو کرابۆوە. دوای دوو سێ ڕۆژ لەو سەردانە هەندێك زەنگیانە و میلی چنین و پەتی تایبەتم کڕی و دەستمکرد بە چنینی جزدان و مەدالیا و ملوانکە، ڕۆژانە هەریەکەو بەکارێکەوە خۆی سەرقاڵ دەکرد، ڕێگەمان پێدەدرا، کە هەندێك کەلوپەلی دیاریکراوی چنین لە حانوتی زیندان داوا بکەین، ئەویش بە چەند هێندە گرانتر لە نرخی خۆی. زەنگیانە و قولاپ و پەتی جۆراو جۆرمان داوا دەکرد و جزدان و مەدالیا و بەرگی قەڵەممان پێ دەچنی. چەند کەسێك شارەزایی زۆریان لە چنین پەیداکردبوو، زۆرجار ناو یان پیتێکمان لەسەر ئەو دەستکردانە دەنووسی. دروستکردنی بورجی ئیفڵ بە دەنکە شقارتە یەکێك بوو لەو کارانەی، کە من ماوەیەکی زۆر خۆم پێوەی سەرقاڵکردبوو و زۆر بەجوانیش دروستم دەرکرد،

بورجی ئیفڵ وردەکاری و سەلیقەیەکی زۆری پێویست بوو سەرەتا دەبوایە چەند شقارتەیەك بێنین و کبریتەکانی بە نینۆکبڕ لێ بکەینەوە، دواتر لەسەر فایلێك نەخشەی بورجەکە بکێشین و بە مقەسێکی بچوك نەخشەکە هەڵکۆڵین، کە تەنها شوێنی دانانی دەنکە شقارتەکە بمێنێتەوە و دواتر بە غەرە دەنکە شقارتەکانمان پێکەوە دەلکاند و بۆ ماوەیەك داماندەنا تا بەتەواوی وشك دەبێتەوە، رۆژانە هەریەکە و بە کارێك خۆی سەرقاڵ دەکرد، بەشێکیان بە چنین و بەشێکیان بە دروستکردنی بورجی ئیفڵ و بینا دروستکردن بە دەنکی شقارتە، هەندێك یاری دۆمینە و تاوڵە و شەترەنجیشی لێبوو، کە دەیانگوت ئەو یاریانە خاچی سوری نێو دەوڵەتی بۆی هێناوین، هەندێك لە زیندانیەکان جار جارە دادەنیشتن و یارییان دەکرد، جگەرەکێشان بە نۆبەت بوو و دەبوایە چاوەڕوان بیت تا کاتی خۆت دێتەوە.

ئەوەندەی کاتیشمان هەبوایە گفتوگۆی سنوردارمان دەکرد بەو مەرجەی گفتوگۆ و گێڕانەوەکانمان دەبوایە دوور بێت لە سیاسەت و باسکردنی بارودۆخی سەختی زیندان، هەمیشە ترس و تارماییێك هەبوو لە قسەکردن، بۆیە خۆمان بەدوور دەگرت لەگفتوگۆی زۆر، ئەگەر بارودۆخیش ئاسایی بوایە هەندێك یاری وەك دۆمینە، شەترەنج و تاوڵەمان هەبوو و خۆمان پێوە سەرقاڵ دەکرد. لەبەر ئەوەی لە دەرەوە کاری سەرتاشیم دەزانی، هەر زوو ئەرکی سەرتاشینی زیندانیەکانیان خستە سەر شانم و دەبوایە بەردەوام

ئەو کارەش بکەم.

یەکەم کار، کە تەواوم کرد جزدانێك بوو بۆ دایکم چنی، بەشێوەی رەنگاوڕەنگ چنیم، یەکێك لە هاوڕێکانم بە باشی فێری چنینی کردبووم و یارمەتیدام بۆ ئەوەی ئەو جزدانە زۆر بە جوانی بچنم. لە دیوی ناوەوەی جزدانەکە هەر بە چنین لێم نووسیبوو (پێشکەشە بە دایکی ئازیزم، بیرت دەکەم، کوڕی خۆت چیا لە زیندانی ئاکرێ). ئەو جزدانە کە تەواو بوو سەرقاڵی ئەوەبووم لەنێو نایلۆنێکی رووندا بە جوانی بیپێچمەوە، پاسەوانێك لەپەنجەرەی ژوورەکەوە سەرنجی جزدانەکەی دابوو، داوایکرد جزدانەکەی بگەیەنمە دەست و سەیری بکات، منیش دامە دەستی و لە ترسی ئەوەی بیبات گوتم بۆ دایکمم چنیوە. ئەو بەردەوام بوو لە سەیرکردنی و کردیەوە، بە سەرسوڕمانەوە گوتی لێتان نووسیوە زیندانی ئاکرێ! بەو بیانوەوە جزدانەکەی برد و رۆیشت، نیوەڕۆ لەسەر نانخواردن بووین، بەڕێوەبەر هات و سەیرێکی منی کرد، گوتی: لەو شتە هیچوپوچانە دەنووسی زیندانی ئاکرێ؟ پێت دەڵێم ئێرە زیندانە یان نا، ئێرە زیندان نییە، بەڵکو (قوتابخانەی بارزانی نەمر)ە، بە چاودێری ژوورەکەی گوت جێگاکەی ببەنە نێو ئاوەکەوە، جێگایان پێ کۆکردمەوە و خستیانمە بەردەم ئەو سەکۆیەی قاپ و شتەکانی تێدا دەشۆرێ و بەشێکی ئاوەکە دەهاتە سەر جێگای من، بەوەشەوە نەوەستان و گوتیان سەری بە گوێزان بتاشن و ئەوەشیانکرد. دوای نانخواردنی ئێوارە دەرگا کرایەوە

دەست و چاویان بەستم و بردمیانە دەرەوە. ئەو شەوە بردیانم بۆ ژێرزەمینێک، هەر لە یەکەم پلەی قادرمەکە فڕێیاندامە خوارەوە و هەستم بە تێکشکانی هەموو گیانم دەکرد، دوای ئەشکەنجەیەکی ئێجگار زۆر و چەندین جار تەزووی کارەبایان لێدام، زیاتر لە سێ کاتژمێر لەژێر ئەو ئەشکەنجەیەدا مامەوە بێ ئەوەی یەک پرسیارم لێبکرێت. تێگەیشتم یەکەمجار چاودێری هۆڵەکەمان کە پێی گوتم ئەگەر پاسەوانەکان بزانن باسی سیاسەتت کردووە ژوورە سیانزە قادرمەییەکەت نیشان دەدەن، ئەوەتا ئەو ژوورەشم بینی بەڕاستی ژورێکی مەترسیدار و پڕ لە ئازار و ئەشکەنجەیە. دواتر بە جەستەیەکی پڕ ئازار بردیانم بۆ ژورێکی تاکەکەسی، کە هیچ شتێکی تێدا نەبوو، بۆماوەی پێنج رۆژ لەو ژوورەدا مامەوە و دوای تەواوکردنی پێنج رۆژەکە بۆ هۆڵەکە گوازرامەوە. ئەو ژوورە تاکە کەسییە هیچ شتێکی تێدا نەبوو، تەنانەت لەسەر ئەرزەکەشی هیچ شتێک رانەخرابوو، پێنج رۆژی سەخت و دژوارم لەو ژوورە بچوک و ناخۆشە تێپەڕاند.

زیندانی ئاکرێ دەکەوێتە سەرەتای بازاڕی ئاکرێ، ئەو بینایە لەسەردەمی رژێمی سەدام حوسێندا، قاتعی جەیشی شەعبی بووە، دوای ئەوانیش پارتی کردوویانەتە زیندان، حەوشەیەکی گەورەی هەیە و حەوت هۆڵی گەورە لەسەر ئەو حەوشەیەدا هەن، تا ئەو کاتە شەش لە هۆڵەکان ئەو زیندانیانەی تێدابوون، کە بەتۆمەتی ئەندام بوونیان لە یەکێتی گیرابوون، یەکێک لە هۆڵەکانیش

پڕکرابوون لە ئەندام و لایەنگرانی پەکەکە، ژوورێکی چاوپێکەوتن و ژووری چێشتخانە و ژوورێکیش بۆ چاوپێکەوتنەکانی کارمەندانی خاچی سوری نێودەوڵەتی لەو چوار دەورەدا هەبوون، کە ئەو ژوورە بۆ چاوپێکەوتنی کارمەندانی خاچی سور لەگەڵ زیندانیان تەرخانکرابوو، سەرەتای هاتنە ژوورەوەش چەند ژوورێکی لێیە، کە هی پاسەوانەکانە و بینایەکی تریش بەڕێوەبەر و ئەفسەرەکان دەوامی تێدا دەکەن.

بەڕێوەبەری زیندانەکە خەڵکی دەوروبەری شارۆچکەی ئاکرێ بوو، جگە لە ئەفسەرێك و چەند پاسەوانێك تێکڕای پاسەوان و ئەفسەرەکانی تر کەسوکاری نزیکی خۆی بوون، یەکێك لە ئەفسەرەکان کوڕی بەڕێوەبەر بوو، کەسێکی دەستڕەش و بێویژدان بوو، باکی بە لێدان و ئەشکەنجەدان نەبوو، ئەو چێژی لە ئەشکەنجەدانی زیندانیان وەردەگرت، لەگەڵ ئەفسەرێکی تر کە ئەویش برازای بەڕێوەبەر بوو، ئەو برازایەی بەڕێوەبەریش کەسێکی تووڕە و ڕق ئەستور بوو، یەکێك لە خولیاکانی ئەوە بوو لە کاتی پیاسەکردنی زیندانیان لە نێو حەوشە کەسێکی بەگیر هێنابایە و بەبەرچاوی هەموانەوە ئەشکەنجەی دەدا. ئەفسەرێکی تری لێبوو هەڵسوکەوتی ئەویش توند و تیژ بوو، بەڵام بەئەندازەی ئەوان نا، ئەو هیچ خزمایەتیەکی لەگەڵ بەڕێوەبەر و پاسەوانەکان نەبوو. پێش ئەویش ئەفسەرێکی تری لێبوو کە خەڵکی پارێزگای سلێمانی بوو، ئەوکاتەی منیان بردە ئاکرێ چەند ڕۆژێك دواتر

ئـەو گوازرایـەوە. دەگوتـرا ئـەو ئەفسـەرەی کـە خەڵکی سلێمانی بـووە هەڵسوکەوتی زۆر خراپتـر بـووە لـە ئەفسـەر و پاسـەوانەکانی تـر. پێدەچوو تێکڕای پاسـەوانەکان جگـە لـە دوانیـان یـان زۆر گوێڕایەڵی بەرپۆمبەرەکەیـان بـوون یـان خۆیـان چێژیـان لـە ئەشـکەنجەدانی زیندانیـان وەردەگـرت، چونکـە کاتێـك مـرۆڤ بیـر لـە دڵڕەقـی و بێویژدانـی ئەوانـە دەکاتـەوە نازانـێ چـۆن پێناسـەیان بـکات و زۆر جاریـش دەمانپرسـی ئـەو دڵڕەقـی و بێویژدانیـە سروشـتی نیـە چونکـە چـۆن دەبێـت مـرۆڤ ئاوابێـت؟.

سـەرەتای مانگـی تشـرینی یەکەمـی ١٩٩٧ رۆژێـك چەنـد کەسـێکی تریـان هێنـان بـۆلای ئێمـە، لەوانـە شـێخ شـڤان و دینـداری تێدابـوو، چـۆن رۆژی یەکـەم پێشوازی لـە ئێمـە کـرا، بەهەمـان شـێوە ئەوانیـش کەوتنـە ژێـر ئەشـکەنجەیەکی زۆر، هەموومـان گوێمـان لـە هـاواری شـێخ شـڤان بـوو دەپاڕایـەوە و دەیگـوت سـێ نەشـتەرگەری دڵـم بـۆ کـراوە لێـم مـەدەن دەمـرم، بـەڵام ئـەوان گوێیـان پێنـەدا و زۆر خراپتـر لێیانـدا. هەردووکیـان هێنـان بـۆ ژووری ئێمـە، شـێخ شـڤان بارودۆخـی زۆر خـراپ تێکچـوو بـوو، خێـرا بـە دزییـەوە هەندێـك ئـاوم خستە بەردەمـی، وەك چـۆن لالـۆ و بەهەمـەن یەکـەم رۆژ پێیـان گوتـم کـە نەدەتوانـم قسـە لەگـەڵ کـەس بکـەم و نـە کەسـیش دەتوانـێ قسـەم لەگـەڵ بـکات منیـش شـێخ شـڤانم تێگەیانـد. جێگاکـەی کەوتـە تەنیشـت منـەوە، بـەڵام نەمدەتوانـی هیچـی بـۆ بکـەم، تەنهـا ئەوەنـدە نەبێـت کـە چاودێریـم دەکـرد و گوتـم ئەگـەر بارودۆخـی خراپتر بێت

چاودێـری ژوورەکـەی لـێ ئـاگادار دەکەمـەوە. بـاش بـوو شـێخ شـڤان نەختێـك هاتـەوە سـەر خـۆی. دوای چل و هەشـت کاتژمێرەکە لەگەڵی کەوتمـە گفتوگـۆ و قسـەکردن، حـەزم دەکـرد خزمەتـی بکـەم، چونکـە ئـەو لـە زینـدانـی دهـۆك زۆر خزمەتـی کردبـووم و بـە تەمەنیـش زۆر لەمـن گەورەتـر بـوو. هـەر لـە ڕۆژانـی سـەرەتای هاتنی شـێخ شـڤان بۆ ئاگـرێ بەخێرایـی لێکۆڵینەوەکانیـان لەگەڵیدا دەسـت پێکردەوە، دوای چەنـد ڕۆژێـك مانـەوەی لـە ژووری تاکەکەسـی و ئەشـکەنجەیەکی زۆر هێنایانـەوە بـۆ هۆڵەکـەی ئێمـە. شـێخ شـڤان هەمـوو ئـەو تۆمەتانـەی ڕەتکردبـۆوە، کـە خسـتبویانە پاڵـی و پێیـان دەگـوت ئەندامـی دەزگای هەواڵگـری تورکیایـت (میـت) کـە بەڵگەیەکیـان لەسـەر دەسـت نەکـەوت ناوبـراویـان گواسـتەوە بـۆ هۆڵـی ژمـارە حـەوت، کـە تایبـەت بـوو بـە گیراوانـی پەکەکـە. تۆمەتەکـەی شـێخ شـڤانیش لـە میتـی تورکییـەوە گـۆڕا بـۆ ئەندامیەتـی پەکەکـە. شـێخ شـڤان ئـەو ماوەیـەی، کـە لای ئێمـە بـوو ئازارێکـی زۆری جەسـتەیی هەبـوو، چەندیـن نەشـتەرگەری دڵـی بـۆ ئەنجامدرابـوو تێکـڕای نەشـتەرگەریەکان بـە سـینگیەوە دیـار بـوون. شـێخ شـڤان تۆمەتەکـەی گـۆڕا و لای ئێمـە گواسـترایەوە. بـەو هۆیـەوە جارێکـی تـر ئەویـان خسـتەوە لێکۆڵینـەوە دەیانویسـت دان بـەوەدا بنێـت، کـە سـەر بـە ڕێکخسـتنەکانی پەکەکەیـە. ئەوجارەیـان بەرگـەی ئەشـکەنجەکانی نەگـرت و لـە ڕۆژێکـی پایـزی سـارددا گیانـی لەدەسـتدا. بـە هەواڵـی گیـان لەدەسـتدانی شـێخ شـڤان زۆر نیگـەران بـووم، بەشـێوەیەك کـە هەسـتمدەکرد کەسـێکی ئازیـزی خـۆم

لەدەستداوە، ئەو نیگەرانیەشم بۆ شێخ شڤان هێندەی تر لەبەر ئەوە بوو، کە لای من چەند جارێك گوتی بیانوم پێدەگرن و دەیانەوێ لەناوم ببەن. لە راستیشدا هەر وابوو، حەوت بۆ هەشت مانگێك بە تۆمەتی ئەندام بوون لە دەزگای هەواڵگری تورکیا دەستگیریان کردووە، کە ئەوەی لەسەر ساغ نەبۆوە تۆمەتەکەیان بۆ گۆڕی و کردیان بە ئەندام و لایەنگری پەکەکە و دواجار لەژێر ئەشکەنجەدا گیانی سپارد.

کەسانێك هەبوون بەرگەی ئەو ئازار و ئەشکەنجانەی زیندانیان نەدەگرت، بەهەرشەیەك رادەست دەبوون و دانیان بە هەموو ئەوشتانەدا دەنا کە داوایان لێدەکرا. لەڕاستیدا ئەو کەسانە زۆر نابوون بەڵام کاریگەری خراپیان دەخستە سەرمان. شەوێك ناوی کەسێکی ناسراو خوێندرایەوە کە بیبەن بۆ لێکۆڵینەوە، ئەو هەر زوو پەیوەندی کرد بە بەرپرسی پاسەوانەکان و پێی راگەیاند کە دان بەهەموو شتێکدا دەنێت! بۆیە ئەوشەوە نەیانبرد بۆ لێکۆڵینەوە و رۆژی دووایی بەبێ ئەوەی دەست و چاوی ببەستن بردیان بۆ ژووری ئەفسەرەکان، پێش ئەوەی بیبەن زۆر لێی پاڕاینەوە کە ناوی کەس نەدات بەڵام ئەو پێچەوانەکەی کردبوو و ناوی دەیان کەسی پێوتبوون کەلەگەڵ ئەودا لە شاری هەولێر کاری رێکخستنیان بۆ یەکێتی کردبوو. دووای دوو رۆژ لە دانانی ئەو کەسە، بیست و هەشت کەس لە هاوڕێیانی ئەویان هێنایە

زیندانـی ئاکـریێ و کەوتنـە ژێـر ئەشـکەنجە و لێکۆڵینـەوە. تـا ئـەو ڕۆژە هەمموومـان ڕێزێکـی تایبەتمـان بـۆ ئـەو کەسـە هەبـوو بـەڵام دووای دانپێدانانەکانـی ئیتـر کـەس بەیانیباشێکیشـی لێنەدەکـرد.
لـەو ڕۆژەوەی گەیشتمە زیندانـی ئاکـرێ لـە چاوەڕوانـی خاچـی سـوری نێودەوڵەتیـدا بـووم، هـەر دەمگـوت ئەمـڕۆ دەگەنـە لامـان و یەکسـەر پرسـیاری مـن دەکـەن، چونکـە لـە مەسـیف بەرپرسـەکە بـە تەلەفـۆن بـە لێکۆڵەرەوەکـەی منـی دەگـوت خاچـی سـور بەدوایـدا دەگەڕێـت و بەڵگەیـان لایـە کـە ئـەو لای ئێمـە زیندانیکـراوە، هیـوای زۆرم لەسـەر ئـەو ڕێکخـراوە نێـو دەوڵەتییـە هەڵچنیبـوو. هەرچەنـدە لـە زیندانـی ئاکـرێ هاوڕێکانـم باسـی شـێوازی کارکردنـی ئـەو ڕێکخراوەیـان بـۆ دەکـردم و پێیـان دەگوتـم، کـە هیـوا لەسـەر ئەو ڕێکخـراوە هەڵنەچنم، بـەڵام بـێ هیـوا نەدەبـووم. دوای زیاتـر لـە دوو مانـگ چاوەڕوانـی، بـۆ یەکەمجـار لـە مانگـی تشـرینی یەکەمـی ١٩٩٧ خاچـی سـوری نێودەوڵەتیـم بینـی. بەڵێنـم لەگـەڵ خۆمدابـوو، کـە چاوپێکەوتـن لەگـەڵ ئـەو ڕێکخـراوە نێودەوڵەتییـە ئەنجام بـدەم ئـەوەی بەسـەریان هێنـاوم باسـی بکـەم، بـۆ ئەو مەبەسـتەش لەگەڵ یەکێك لـە هاوڕێکانم گفتوگۆم کـرد، ئـەو هـەر زوو گوتـی بیـر لـەو کارە نەکەیتـەوە، توشـی کێشـەی گـەورەت دەکـەن. ئـەو گوتـی خاچـی سـوور وا دەزانـن ئێـرە پاریـس و بەرلیـن و سـتۆکهۆڵمە و ڕێـز لـە قسـەکانیان دەگیـرێ، ئـەوان زۆر سـەیر کار دەکـەن، چەندیـن کەسـیان بـە لێدانـداوە و لێشـیان نەپێچاوەتـەوە. ماوەیـەك دوای ئـەو گفتوگۆیـەم بەیانییێکـی

زوو ئۆتۆمبێلەکانی خاچی سووری نێودەوڵەتی لەنێو حەوشەی زیندان دەرکەوتن، دەرگا کرایەوە و کارمەندێکیان هاتە ژوورەوە، داوای کرد کێ تا ئێستا لەلایەن خاچی سوورەوە تۆمار نەکراوە هەستێتە سەرپێ. ئەو ژوورەی ئێمە زیاتر لە پانزە کەسی لێبوو کە تۆمار نەکرابوون. کارمەندەکە دەستی کرد بە پڕکردنەوەی فۆڕمی زانیارییەکانی، کە نۆبەتی من هات، جگە لە پڕکردنەوەی فۆڕمەکە چەند پرسیارێکیان لێکردم و وەڵامم دانەوە، کە دڵنیا بوونەوە لە ناسنامەی من، ئینجا گوتیان کەسوکارت سەردانی ئۆفیسی سلێمانی رێکخراوەکەمانیان کردووە و داوایانکردووە کە رێکخراوەکەمان تۆ بدۆزێتەوە و پارێزگاریت لێ بکەن. ئەوان ناوی کەسیان نەهێنا لە کەس و کارەکەم، بەڵام دوای ماوەیەك زانیم، کە مامم نیاز و پورە شیلانم سەردانی خاچی سووریان کردبوو. دوای ئەو گفتوگۆیانە داوامکرد، کە نامەیەك بنووسم بۆ شیلانی پورم کە هەم پورمە و هەم هاوڕێیەکی نزیکم. ئەو ئەوکاتە مامۆستابوو لە خوێندنگای دواناوەندی سەرکەپکان لە نزیك شاری رانیە. نامەکە لەسەر کلێشەیەکی دیاریکراوی خاچی سووری نێو دەوڵەتی بوو، بە وشە دیاری کرابوو کە نابێت زیاتر بنووسی، هەر زوو هاوڕێیەکەم پێی گوتم، کە نامەکە بەر لەوەی خاچی سوور بیبات ئیدارەی زیندان دەیبینێ بۆیە ئاگاداربە، منیش جگە لە هەواڵپرسین هیچی ترم نەنووسی. هەر ئەوکاتەش داوای چاوپێکەوتنی تایبەتم لە کارمەندەکەی خاچی سوور کرد، پێگوتم

دەبێ چاوەڕێ بم ڕۆژی دواتر وەڵامم دەدەنەوە. ئەو ڕۆژە جگە لە پڕکردنەوەی فۆڕمەکە و نووسینی نامەکە خاچی سوور پاکەتێکیان پێدایین، دەستێك جلی نووستن و سابوونێك و دوو پاکەت جگەرەی زۆر خراپ و دوو دەست جلی ژێرەوەی تێدابوو، ئەو پاکەتە درایە هەموو زیندانیان. خاچی سوور دوو بۆ سێ مانگ جارێك دەهاتن و دوو ڕۆژ لەوێ دەمانەوە، من ئەو دوو ڕۆژە چاوەڕوانی چاوپێکەوتنەکە بووم، بەڵام دەرفەتیان پێنەدام. دوای ئەوەی خاچی سوور ڕۆیشت ئێوارەکەی دوو کەسیان لە هۆڵی دوو و هۆڵی چوار هێنایە دەرەوە بەشێوەیەك ئەشکەنجەیاندان، کە تا ئێستاش دیمەنی ئەو ئەشکەنجەدانەیان وەك فیلمێکی سینەمایی لە خەیاڵمدا ماوە و بۆ ساتێکیش لەبیری ناکەم. کە ئەشکەنجەدانەکەیان تەواو بوو، بەرپرسی پاسەوانەکان بە هەموو هۆڵەکاندا گەڕا و گوتی ئەو دوو کەسە چونەتە لای خاچی سوور و گوتویانە کە ئەشکەنجە و لێدان هەیە و ژیانمان ناخۆشە. ئێوە قسە بکەن و ئێمەش ئاوا وەڵامتان دەدەینەوە. پێتان وایە خاچی سوور بەردەوام لێرەیە، ئەوان تەنها ئەرکیانە جلوبەرگتان بۆ بێنن و هیچی تر. تومەز هەر کەسێك لای خاچی سوور سکاڵا دەکات ئەوان دەچن بە بەڕێوەبەرایەتی زیندان دەڵێن، کە ئەو کەسە ئەو سکاڵایەی هەیە ڕاستە یان نا؟ ئەو ڕەفتارەی خاچی سوور زۆر بێزارکەر و قێزەون بوو، تا ئەندازەیەك پێمان وابوو زۆر نامرۆڤانەشە، بەڵام هەمیشە بەبەر خۆمەوە دەمگوت خۆ ئەگەر یەکێك بە خاچی سوور بڵێ، کە

ئێـوه خەڵـك تووشـی ئەشـکەنجه دەکـەن بـەو ڕەفتارانەتـان ڕەنگـه بارودۆخەکـه بگۆڕێـت و ئەوانیـش جارێکـی تـر نەچـن نـاوی هیـچ کەسـێك بدەنـه بەڕێوەبەرایەتـی زینـدان.
لـەو زینـدانـەدا زۆر بـەوردی چاودێـری مـن دەکـرا، هەڵسوکەوتەکانم هێنـدەی تـر کۆتوبەنـد کرابوون، نەمدەتوانـی دەردە دڵێـك لای هیـچ کەسـێك بکـەم، توانـای دەربڕینـی هیـچ شـتێکم نەبـوو، بەڕێوەبـەر و پاسـەوانەکان زۆر بەبـێ ویژدانـی مامەڵەیـان لەگـەڵ دەکـردم. لەگـەڵ ئـەوەی زیندانیەکـی سیاسـی بـووم و بەتۆمەتـی ئەنـدام بوونـم لـه یەکێتـی نیشـتمانی کوردسـتان و هەڵوێسـتی کەسـوکارەکەم دەسـتگیر کرابـووم، بۆشـم دەرکـەوت کـەوا بەڕێوەبـەر ڤینێکـی بـێ سنوریشـی بەرامبـەر مـن و کەسـوکارەکەم هەیـە، هـەر بۆیـە بـە هـۆکار و بـێ هـۆکار ئەشـکەنجه دەدارم. سـەرەتای مانگـی تشـرینی یەکەمـی ١٩٩٧ یەکێتـی و پەکەکـە لەشـەڕێکدا تەنگیـان بـە پارتـی دیموکراتـی کوردسـتان هەڵچنـی، چەنديـن شـوێنی گرنگيـان لەژێـر دەسـتی پارتـی دەرهێنـا، ئێمـە تەنهـا ئێـواران بۆمـان هەبـوو گـوێ لـە رادیـۆی دەنگـی کوردسـتانی عێـراق بگریـن، کـە لای چاودێـری هۆڵەکـە دانرابـوو، هەرچەنـدە لـەو رادیۆیـەدا باسـی شـەڕەکەی دەکـرد، بـەڵام دەیگـوت لـە هەمـوو شـوێنەکان شکسـتمان پـێ هێنـاون. شـەوێك یەکێـك لـە هاوڕێکانـم هاتـە لام، گوتـی بـە دزییـەوە گوێـم لـە رادیـۆی دەنگـی گەلـی کوردسـتان گرتـووە، ئـەو رادیۆیـە زمانحاڵـی یەکێتـی بـوو، ئـەو شـوێنی خەوتنـی دەکەوتـە تەنیشـت چاودێـری ژوورەکـە بەیەکـەوەش

نانیـان دەخـوارد و زۆر هـاوڕێ بـوون بۆیـە هەلێکـی دۆزیبـۆوەو بـە دزیـەوە گوێـی لـەو رادیـۆدە گرتبـوو، پێدەچـوو چاودێرەکـەش چاوپۆشی لێکردبێت، ئـەو گوتـی باوکت و مامت نیاز چاوپێکەوتنیان هەبـوو، ئـەوان لـە چۆمـان و گەڵاڵـە قسـەیان بـۆ پەیامنێـری رادیۆکـە دەکـرد و باسـی دوا شـەڕی ئـەو ناوچەیەیـان دەکـرد٠ گوتـی خـۆ ئـەو شـوێنانەیان هەمـووی لەژێـر دەسـتی پارتـی دەرهێنـاوە! مـن زۆر بـەو هەواڵـە دڵتەنـگ بـووم، دەمزانـی بەڵایەکـی تـر بەسـەر مـن دەهێنـن، پێیگوتـم هەسـت دەکـەم بـە هەواڵەکـە دڵخـۆش نەبوبیـت، پێمگـوت کـە بـە هیـچ شـێوەیەك ئـەوە نەدرکێنـێ، چونکـە ئەگـەر بەڕێوەبـەر و پاسـەوانەکان بـەوە بزانـن باوکـم و مامـم چاوپێکەوتنیـان هەبـووە ئـەوا بیانویەکـی تریـان دەکەوێتـە دەسـت و دڵنیـام، کـە رووبـەڕووی نەشـکەنجەیەکی زۆر خراپـم دەکەنـەوە٠ لەوکاتـەدا خەیاڵـی جۆراوجـۆرم دەکـرد، تۆبڵێـی بەڕێوەبەرایەتـی زینـدان ئـاگاداری ئـەو چاوپێکەوتنانـەی بـاوك و مامـم بـن؟ بڵێـی کەسـێك لـە دەرەوەی زینـدان لەوبارەیـەوە راپۆرتێکیـان پێنـەدات، ترسـم لـەوە نەبـوو لەنـاو زینـدان کـەس باسـی ئـەو چاوپێکەوتنـە بـکات، چونکـە هـەر کەسـێك شـکایەتێکی وا لەمـن بـکات خۆیشـی توشـی کێشـەی گـەورە دەبێـت، چونکـە گوێگرتـن لـەو رادیۆیـە نـەك هـەر قەدەغەیـە، بەڵکو تاوانێکـی گەورەشـە، ترسـێکی زۆر دایگرتـم، چونکـە دەمزانـی ئەگـەر هەواڵێکـی لـەو شـێوەیە بگاتـە بەڕێوەبەرانـی زینـدان بارودۆخـی مـن دژوارتـر دەبێـت و رەنگـە ژیانـم بەتـەواوی بکەوێتـە مەترسـیەوە٠

ئـەو دوو رۆژە بـارودۆخ لەنێـو زینـدان زۆر نائاسـایی بـوو، تێکـڕای پاسـەوانەکان لەوێبـوون و چـەك و تاخمـی تەواویـان پێبـوو، سـەربان و نـاو حەوشـە و تـەواوی ئـەو ناومیـان تەنیبـوو، ئێمـە هەسـتمان دەکـرد رووداوێـك روویـداوە، دەمانزانـی بارودۆخەکـە ئاسـایی نییـە، تەنانـەت رێوشـوێنی زۆر تونـد دەگیرانەبـەر کاتێـك دەیانبردیـن بـۆ سـەراو، پیاسـەکردن نەمـا و سـەردانیش بـە هەمـوو شـێوەیەك راگیرابـوو، دوای دوو رۆژ بارودۆخەکـە ئاسـایی بـۆوە، ئێوارەیـەك لەنێو حەوشـە پیاسـەمان دەکـرد، کـە چەنـد رۆژێـك بـوو چونـە نێـو حەوشـە قەدەغـە کرابـوو و ئـەوە رۆژی یەکـەم بـوو دوای قەدەغـەو پیاسـەمان دەکـرد، چاوەڕوانـی ئـەوە بوویـن نۆبەتمـان بێـت بچینـە سـەرئاو، یەکێـك لـە هاوڕێکانـم بـە هێواشـی چرپانـدی بەگوێمـدا و گوتـی کـە چویتـە سـەرئاو لـە پەنجـەرە بچووکەکـەوە سـەیرێکی دەرەوە بکـە، لـەو پەنجـەرە بچوکـە جـادەی سـەرەکی ئاکـرێ دیـار بـوو، کـە رێـگای سـەرەکی نێـوان پارێـزگای هەولێـر و دهـۆك بـوو، چومـە سـەراو و لەپەنجـەرە بچووکەکـەوە سـەیرێکی جادەکـەم کـرد، بەدەیـان ئۆتۆمبێلی بارهەڵگری سـەربازییم بینـی، کـە تانـك و تۆپ و زرێپۆشـیان بـار کردبـوو و بـە ئاراسـتەی شـەقڵاوە و سـۆران و هەولێـر دەچوون، بـە روونـی دیـار بـوو، کـە ئـەو تانـك و تـۆپ و زرێپۆشـانە لەشـکری تورکیایـە، بـەو دیمەنـە زۆر دڵتەنـگ بـووم، تێگەیشـتم کـە تورکیا هێنراوە بۆ لێدانی هێزەکانی پەکەکە و یەکێتی، توشـی تاسـان و دڵەڕاوکێیەکـی زۆر بـووم، بـەڵام نەموێـرا لای کـەس باسـی بکـەم،

ترس و نیگەرانی من زیاتر لەوە بوو، کە ژیانی ئێمەش هێشتا بەرەو مەترسی و دژواربوونی زیاتر دەڕوا، چونکە تا شەڕەکان سەختتر دەبوون، فشارەکانی سەر ئێمەش زیاتر و زیاتر دەبوون، هاوڕێکەم تێگەیاند کە بەهیچ شێوەیەك باسی نەکات، چونکە ئەو هەواڵە لە دەمی ئێمە بڵاو بێتەوە کێشەی گەورەمان بۆ دروست دەبێت، دوای نانخواردنی ئێوارە تێگەیشتم کە زۆر کەس ئەو دیمەنانەی بینیوە، کە من لەپەنجەرە بچوکەکەی تەوالێتەکەوە بینیم، بەڵام نە گوێم لە قسەو باسەکان گرت و نە واشم نیشاندا کە ئەو دیمەنانەم بینیوە، رۆژی دواتر پێش نانخواردنی نیوەڕۆ من بانگ کرامە دەرەوە، منیان برد بۆ ژووری بەڕێوەبەر، لەگەڵ چونە ژوورەوەم گوتی باوکت و مامت نەیانزانیوە، کە تۆ لەبەر دەستی ئێمەی بۆیە بەبێ منەتی لە رادیۆ جنێوفرۆشەکەیان قسە لەسەر حزبەکەی ئێمە دەکەن، بە هەڕەشە و دەنگێکی بەرزەوە گوتی ئێستا تۆ تێدەگەیەنم لە دژی ئێمە وەستانەوە چییە، ئینجا با باوکت و مامت فریات بکەون، من هیچ قسەیەکم نەکرد بۆیە پێدەچوو ئەو زیاتر تورە بوبێ لە بێدەنگی من، لە پڕ هەردوو دەستی بەتوندی کێشا بە مێزەکەی بەردەمیدا و هاواری کرد و گوتی: لاڵ بووی بۆ قسە ناکەیت؟ .

منیش زۆر بە هێواشی گوتم: بۆ مەگەر دەتوانم شتێك بڵێم؟ بەو قسەیەم زۆر پەست بوو و گوتی قوڕ لە دەمت دراوە؟ بە پاسەوانەکەی گوت بیبە دەرەوە و تێی بگەیەنە ئەو لە کوێیە،

رەنگە هێشتا خۆیشی نەیزانیبێت، پاسەوان هەر منی گەیاندە ئەودیو دەرگای بەرپوەبەر، کەوتە گیانم و چەند پاسەوانێکی تریش هاتن بۆ یارمەتیدانی، لەنێو حەوشەی زیندان ئەو رۆژە کوڵی دڵی خۆیان بە من رشت، تا شەکەت بوون لێیاندام و بەرەو ژووری تاکەکەسیان بردم، لەبەر دەرگا پاسەوانەکە گوتی سەیرمکە و سەرت بەرزکەرەوە لەگەڵ سەرم بەرز کردەوە بە هەموو هێز و توانای خۆی کەللەیەکی کێشا بە لوتما و دەم و لوتم پڕ بوو لەخوێن، بۆماوەیەکی باش پێش چاوم تاریك بوو و چاوەکانیشم پڕ بوون لە ئاو، لەتاو ئازاری سەروچاوم نەمدەزانی چی رودەدات، دوای ئەوە خستیانمە ژوورە تاکە کەسییەکە، ژوورێکی زۆر سارد، دەرگا و پەنجەرەیەکی ئاسنی هەبوو، پەنجەرەکە چەند شیشێکی پێوەبوو، بەڵام نە شوشە و نە نایلۆن و نە هیچ شتێکی پێوەنەبوو، پەنجەرەکە زۆر گەورەش بوو بەتەواوی هەستت دەکرد لە دەرەوەی نەك ژوورەوە، تا درەنگانی ئێوارە خوێن لە لوت و دەمم نەوەستا، فانیلەی ژێرەوەی جلەکانم داکەند بۆ ئەوەی خوێنەکەی پێ بسڕم بەڵام سوودی نەبوو، هەستم دەکرد روخسارم ئاوساوە و خوێنیش لەجەستەمدا نەماوە، هەموو گیانم ئازاری هەبوو، لە سوچێکی ژوورە بچوکەکە خۆم کۆکردبۆوە سەریەك لە ترسی سەرما و ئازاری جەستەم، ئێوارە داهات و چاوەڕێی ئەوە بووم لانی کەم بەتانییەکم پێ بدرێت، بەڵام پێچەوانەکەی راست بوو، لە درەنگانی شەودا بە سۆندە لە پەنجەرەکەوە ئاویان

پێداکـردم تـا هەمـوو گیانـم بەتـەواوی تـەڕ بـوو و ژوورەکـەش ئاوێکـی باشـی تێچـوو، ئـەو شـەوە تـا ڕۆژ بـۆوە بـە پێـوە وەسـتام و هـەڵ لەرزیـم، بـڕوام بـەوە نەبـوو گیانـم بـە سـەلامەتی ڕزگاری بێـت، ئـەو ڕۆژەش لەبـەر سـەرما و برسـێتی و ئـازاری جەسـتە وەك گـەڵای دار هەڵدەلەرزیـم، جلەکانـم وشـك نەبووبونـەوە، تـا دەهـات بێهێـز دەبـووم و توانـای ئـەوەم نەبـوو بتوانـم بـە پێـوە بوەسـتم، ئـەو شـەوەش بـە هەمـان شـەوی پێشـوتر و بگـرە خراپتریـش ڕۆژم کـردەوە، تـا گەیشـتە نیـوەڕۆ، نیـوەڕۆ دەرگایـان لێکردمـەوە و بەلێـدان و ئیهانـەوە بردیانمـەوە هۆڵەکـەی لێیبـووم، بەپەلـە جلەکانم گۆڕی و خۆم خسـتە ژێـر بەتانییێـك، بـەڵام پێدەچـوو بەئاسـانی ئـەو ئـازارە تێنەپەڕێنـم، چونکـە هـەر زوو هەسـتم کـرد پلـەی گـەرمـی جەسـتەم بـەرز بۆتـەوە و قوڕگـم بەیەکـدا نوسـاوە، کـە شـەو داهـات تووشـی لەرزێکـی ئێجـگار زۆر هاتـم، دکتـۆر موحسـین یەکێـك بـوو لـە زیندانیـەکان، پیاوێکـی تەمـەن مامناوەنـد، بـەڵام زۆر شـارەزا لـە زانسـتی پزیشـکی و دریغـی نەدەکـرد لـە خزمەتـی زیندانیـان، ئەوەنـدەی ڕێیـان پـێ دابوایـە فریامـان دەکـەوت، ئـەو پیاوێکـی میهرەبـان و سـادە بـوو، هەمیشـە هەسـتی باوکایەتـی بەهەمومـان دەدا، هەرچەنـدە هیـچ پێداویسـتییێکی پزیشـکی و دەرمانێکـی لا نەبـوو، بـەڵام لـە کاتـی زۆر پێویسـتدا داوای دەکـرد و قەناعەتـی بـە پاسـەوانەکان دەهێنـا کـە دەرمانـی بـۆ بێنـن، ئـەو لـە هۆڵـی شـەش بـوو، چاودێـری هۆڵەکەمـان تکایەکـی زۆری لـە پاسـەوانەکان کـرد، کـە دکتـۆر موحسـین بێنـن

و پشکنینم بۆ بکات، درەنگانی شەو دکتۆر موحسینیان هێنا و چەند پشکنینێکی بۆکردم، تەنها بە سەیرکردن و بە دەست، ئەو وتی پلەی گەرمی لەشی بەرێژەیەکی زۆر بەرزە و قورگیشی هەوی کردووە و لوتیشی شکاوە، ئەو داوای چەند دەرمانێکی کرد و رۆژی دواتر هەندێك لە دەرمانەکانیان بۆ هێنام، بەڵام بەهۆی سەرمابوونێکی زۆر زیاتر لە بیست رۆژ لە جێدا کەوتم و چاك نەبووم، نە خەوم هەبوو و نە دەشمتوانی هیچ جۆرە خواردنێك بخۆم، هەستم دەکرد کێشی جەستەم هێندە دابەزیوە کە جێی بڕواکردن نیە، ئێوارەیەکیان دکتۆر موحسین هاتەوە بۆلام و سەیرێکی قورگی کردم و پێوانەی بۆ پلەی گەرمی لەشم کرد، گوتی هیچ چارەمان نییە دەبێ قورگت پاك بکەمەوە، منیش رازی بووم، چونکە بارودۆخی تەندروستیم زۆر خراپ و ناجێگیر بوو، تۆپەڵێك لەفافی گەورەی لە سەری مەقەسێك ئاڵاند و خستیە نێو قورگم، چەند جارێك بەملا و ئەولادا سوڕاندی، کە هێنایە دەرەوە هەرچی کێم و پیسی هەیە هەڵی کەندبوو، هەرچەندە ئازارێکی ئێجگار زۆرم بینی، بەڵام هەم دڵسۆزی دکتۆر موحسین و هەم ئازاری رۆژانی رابردوو وایلێکردم بەرگەی ئەوەش بگرم، ئەو کارەی دکتۆر موحسین و دەرمان و چاودێریکردنەی وایکرد ورده ورده بەرەو باشی بڕۆم و تەندروستیم جێگیر بێتەوە، دوای چاکبوونەوەم لە نەخۆشیەکەم و تێپەڕینی مانگێك بەسەر ئەشکەنجە و لوت شکاندنەکەم کە هێشتا بەتەواوی نەهاتبوومەوە

سەر خۆم، ئێوارەیەك هەموومان لە نێو حەوشە بووین و لە چاوەڕوانی ئەوەدابووین نۆبەتی سەرتاومان بگاتێ، ئەو پاسەوانەی پێش مانگێك بێ بەزەییانە لوتی شکاندبووم، لەولاوە هات و گوتی کوا بزانم لوتت چاکبۆتەوە؟ چەناگەی گرتم و وەك چۆن پزیشکێك پشکنینم بۆ بکات ئاوا سەیری لوتی دەکردم، بەلام ئەوەی چاوەڕێ نەبووم روویدا، زۆر بێ ئاگا بووم جارێکی تر پاسەوانەکە بە هەموو هێزی خۆی کەللەیەکی کێشایەوە بە لوتمدا و ئیتر هەستمکرد، کە رۆحم لەگەڵ خوێنی لوتم هاتە دەرەوە و کەوتمە سەر زەوی، ئاگام لێبوو بە دوو کەس لە زیندانییەکانی گوت فۆڵی بگرن و بیبەنە ژوورەوە، ئەو شەوە تا درەنگانێك خوێن بە شێوەی جۆگەلە لە لوتم دەهات، بەیانیش کە سەیری سەر جێگاکەم کرد خوێنێکی ئێجگار زۆرم لێ رۆیشتبوو، جارێکی تر هەموو روخسارم رەش هەڵگەڕا و بەتەواوی ئاوسا، تا ئەوجارەش لوتم چاکبۆوە ماوەیەکی زۆر باشی ویست.

سەرەتای زستانی ١٩٩٧ بوو، زستانێکی سارد و ناخۆش، بارودۆخی زیندانی ئاگرێ تا بڵێی ناهەموار و بێزارکەر بوو، دوای شەڕی پایزی هەمان ساڵ خەڵکێکی ئێجگار زۆر دەستگیر کرابوون و هێنرابوونە ئاگرێ، شوێنی خەوتن و هیچ جوڵەیەك لە هۆڵەکاندا نەمابوو. ئێوارەیەك دەرگای هۆڵی پێنج کرایەوە و مام حاجی تەمەن ٧٥ ساڵانیان هێنایە دەرەوە، پاسەوانەکان لەگەڵ حاجی کەوتنە قسە، ئێمە ئەوانمان نەدەبینی، بەلام دەنگیان بە ئاسانی

دەگەیشتە لای ئێمە، دیار بوو یەکێک لە پاسەوانەکان چەند جارێک پێیدەگوت تۆ درۆ دەکەیت نە حەجت کردووە و نە موسوڵمانیشی، کەسێك دوو جار حەجی کردبێت و موسوڵمان بێت چۆن نوێژ ناکات؟ حاجی داوای لێدەکردن گوێی لێبگرن بەڵام دەرفەتیان نەدەدا دوای هەوڵێکی زۆر حاجی رازیکردن کە خولەکێك گوێی لێبگرن و دەستی کرد بە قسەکردن، ئەو گوتی تەمەنم حەفتا و پێنج ساڵە و زیاتر لە شەست ساڵە نوێژ و عیبادەت دەکەم و دوو جاریش سەردانی ماڵی خوام کردووە، بەڵام لێرە نوێژ ناکرێت نە گەرماو هەیە خۆمانی لێبشۆین نە تەوالێتێك هەیە پاکوخاوێنی خۆمانی تێدا بکەین، کوا بە پەرداغێك ئاو دەستنوێژ دەگیرێ؟. حاجی راستی دەکرد کوا رێگەمان پێدەدرا خۆمان بشۆین، خۆ ئەگەر رێگەشیان بدابایەن ئاوێکی زۆر کەمیان پێدەداین کە بەشی هیچی نەدەکرد یەکێك لە گرفتە گەورەکانی ئێمە نەبوونی حەمام بوو، بەتایبەت لە وەرزی زستانانددا بە دوو مانگ جارێك دەرگای حەمامەمان بۆ دەکرایەوە، دەبوایە لەماوەیەکی کورتی دیاریکراودا بە ئاوێکی زۆر کەم خۆمان شوشتبا، کە کەسێك دەوەستا دۆلکەیەك ئاوی دەکرد بەسەرماندا و دەبوایە سابون لەسەر و لەشمان بدەین و دواتر دۆلکەیەکی تری ئاوی دەکردەوە بەسەرماندا، هەربۆیە ئەسپێ هەموو گیانمانی تەنیبوو و بەردەوام خەریکی هەڵکڕاندنی جەستەمان بووین. زۆر جاریش شوێنی دورومانی جلەکانمان هێندە پڕ دەبوو لە گەرا و ئەسپێ

بە چەرخ دەمانسوتاند، جل شوشتن وەرزی جارێك ئەگەر رێیان دابایەن، رۆژانەش دووجار دەرگا دەکرایەوە بۆ تەوالێت، چاودێرێك دادەنرا و بەدەنگێکی بەرز تا ژمارە دەی دەژمارد دەبوایە بێیتە دەرەوە ئەگەر لەو کاتەیا نەهاتینایە دەرەوە چاودێرەکە شەقێکی لە دەرگای تەوالێتەکە هەڵ دەدا و بەر سەروچاومان دەکەوت و دواتریش لەلایەن پاسەوانەکانەوە سزا دەدراین.

دوای ئەو قسانەی حاجی کردی لەگەڵ پاسەوانەکان، دیار بوو پاسەوانەکان زۆرتر لێی تورە بوون و کەوتنە گیانی و زۆر بە خراپی لێیاندا، تا حاجی گوتی باشە نوێژ دەکەم، دوای رازیبوونی حاجی بە داواکاریەکەیان، ئێوارە بانگی مەغریبیدا و پاسەوانەکان لەپەنجەرەوە بەدیار حاجییەوە وەستان تا بزانن نوێژ دەکات یان نا، حاجی دوای دەستنوێژ هەلگرتن دەچێتە سەر بەرماڵ و بە دەنگێکی بەرز، کە پاسەوانەکان گوێیان لێبێت هەردوو دەستی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ (خودایە نیەتم هەیە سێ رکەعەت نوێژی مەغریب بکەم بۆ ئەو پاسەوانانە) کە پاسەوانەکان گوێیان لەو نیەت هێنانەی دەبێت دیسانەوە دەرگا دەکەنەوە و حاجییان هێنایە دەرەوە تا لەهۆش خۆی چوو لێیاندا، درەنگانێکی شەو هەستمان بە جموجوڵێکی نا ئاسایی کرد، گوێمان لێبوو دەرگای یەکێك لە هۆڵەکان کرایەوە و روناکی گلۆپی ئامبولانسیش دیار بوو، لەبەر ئەوەی مافی سەر هەڵبرینمان نەبوو، کەس هیچی بە چاوی خۆی نەبینی تا رۆژی دوایی هەواڵی کۆچی دوایی مام

حاجیمـان پێگەیشت، کـە دوای ئـەو ئەشـکەنجەدانەی شـەوی رابـردوو لـە درەنگانێکـی شـەو کۆچـی دوایـی کـرد٠
لەو زیندانە چەندین یاسـا و رێنمایی سـەیر هەبوو، دەبوایە پێیانەوە پابەنـد بیـن، خـۆ ئەگـەر پابەنـد نەبوینایـە ئەشـکەنجەدان بەشـێکی زۆری ژیانمـان دەبـوو٠ ئـەوان زۆر بانگەشـەی موسـوڵمانیەتیان دەکـرد، بـە رواڵـەت دەیانویسـت بـە ئێمـەی زیندانـی بڵێـن، کـە ئـەوان لـە موسـوڵمانییێتیدا لەپێـش هەمـوو کەسـێکەوەن٠ لـە مانگـی رەمەزانـدا هـەر کەسـێك لـە زیندانیـان بـەڕۆژوو نەبوایـە ئەشـکەنجە دەدرا و سـزای تونـدی بەسـەردا دەسـەپێنرا، تەنهـا پارشـێوان و ئێـواران خـواردن دابـەش دەکـرا، ئەگـەر رۆژێـك بـەڕۆژوو نەبوینایـە پێویسـت بـوو کـەس نەزانێـت، چوونکـە لـە نێـو زیندانـدا چەنـد کەسـێکیان وەك جاسـوس دانابـوو، ئـەو جاسوسـانە هەواڵیـان لەهـەر کەسـێك دابوایـە بـێ شـك بـە هیلاکیـان دەبـرد٠ جگەرەکێشـان و خـواردن و خواردنـەوە لـە رۆژدا بـە هەمـوو شـێوەیەك قەدەغەبـوو، لەکاتـی بانگدانـدا دەبوایە هیـچ کەسـێك قسە نـەکات و بێدەنـگ بێـت، هـەر کەسـێك قسـەی بکردایـە بـە تۆمەتـی بێڕێـزی بـە بانـگ سـزا دەدار، نوێژکـردن بـە زۆرەملـێ بـوو و دەبوایـە هـەر پێنـج فەرزەکـە نوێـژ بکەیـن، بـەڵام کـە لـە رەفتارەکانـی ئەوانیشـت دەڕوانـی و دڕندەیـی و بێویژدانـی ئەوانـت دەخسـتە بەرچـاو لـە هیـچ دینێکـدا جێگـەی نەدەبـۆوە٠
خەڵکێکـی زۆر لـەو زیندانـەدا بـوون بـە بیانـوی سـەیر و سـەمەرە

دەستگیر کرابوون، چونکە بڕیاری دەستگیرکردنەکان یاسایی نەبوو و حزب بەشێوەی زارەکی فەرمانی گرتنی کەسەکانیان دابوو، هەندێکجار کە گوێبیستی بیانوی گیرانی هەندێك هاوڕێ دەبووین نەماندەزانی پێبکەنین یان خەفەتیان بۆ هەڵگرین، لەراستیدا ئەگەر پێکەنینیش بیگرتباین لەخەفەتەوە بوو نەك دڵخۆشی.

یەکێك لە هاوڕێ زۆر نزیکەکانم خەڵکی شارۆچکەیەکی نزیك شاری هەولێر بوو، ئەو بە بیست و پێنج ساڵ لەمن گەورەتر بوو پیاوێکی بەڕێز و قسەخۆش بوو زۆر ڕێزی منی دەگرت و لەهەموو ناخۆشییەکان دڵی دەدامەوە و ناوە ناوەش دەیچرپاند بە گوێمدا و دەیگوت تۆ لە هەموومان بچوکتری بەڵام ئازا و چاونەترسی. ئەو جاری دووەم بوو دەستگیر بکرێت و بیهێنن بۆ زیندانی ئاکرێ، ئەو کێشەیەکی هەبوو هەرکەسێك باسی تەنەکە ڕۆنی بکردایە لە جێی خۆی گڕی دەگرت و خراپ تووڕە دەبوو، منیش نیگەران دەبووم لەو کەسانەی ئەو قسەیەیان پێدەگوت بێ ئەوەی بزانم ماناکەشی چیە. ڕۆژێك زۆر بە ئارامی پێمگوت نازانم ئەوەی تۆ پێی تووڕە دەبی مانای چیە و ناشمەوێ بیزانم، بەڵام تا تۆ تووڕە بیت خەڵك زیاتر پێت دەڵێن، بۆیە ئەو پێشنیارە لە برای بچوکی خۆت وەرگرە ئەوجارە هەر کەسێك پێی گوتی تۆش لەگەڵی پێبکەنە، لەراستیدا منیش نەموێرا لێی بپرسم مەسەلەی تەنەکە ڕۆن چیە، چونکە نەم دەویست لێم تووڕە بێت. بەڵێنی پێدام کە وابکات، یەك دوو جارێك پێیان گوتبوو

ئـەو خـۆی تێکنەدابـوو ڕۆژێـك هاتـە لای مـن و گوتـی فـلان کـەس دووجـار وای پـێ گوتـووم، منیـش پێکەنیـوم هەرچەنـدە خەریکـە لـە داخانـا دەمـرم، بـەڵام بەسـەر خـۆم نەهێنـا، ئیتـر ماوەیەکـی بەسـەردا تێپـەڕی و هـەر کـەس باسـی تەنەکـە ڕۆنـی بکردایـە ئـەو خـۆی تێـك نـەدەدا و بـە ئاسـایی وەری دەگـرت. ڕۆژێـك پێمگـوت دەسـتتخۆش بێـت ئەهـا چـۆن چارەسـەر بـوو، خـۆ ئەگـەر ئـاوات نەکردایـە ڕەنگـە تـا ئێسـتا لەزۆربەیـان دڵگـران دەبوویـت، ئێسـتا چونکـە تـوڕە نابیـت کـەس بیریشـی نەمـاوە لەگـەڵ ئـەوەش گوتـم ئێستا بۆم هەیـە بپرسـم مەسـەلەی ئـەو تەنەکـە ڕۆنـە چیە؟ هەسـتم کـرد هێشـتا پێیناخۆشـە بـەڵام دڵـی نەهـات لەمـن توڕەبێـت و داخێکی قوڵـی هەڵکێشـا و گوتـی: مـن سـەرقاڵی کاری دوکانداریـم لەنێـو بـازاڕ دوکانـم هەیـە، دەسـەڵاتدارانی شـارۆچکەکەمان دەزانـن، کـە ئێمـە وەك بنەماڵـە پشـتگیری حزبەکەیـان ناکەیـن و سـەرقاڵی کار و کەسـابەتی خۆمانیـن. بـەردەوام بیانوومـان پێدەگـرن، بـەڵام هـەر خـۆم ڕاگرتبـوو، دوکانـی تەنیشـتم فرۆشـگای خـۆراك و ئازوقەیـە، دۆستایەتیشـم لەگەڵیـان زۆر خـۆش بـوو، ڕۆژێـك بارێکـی ڕۆنیـان بـۆ هاتبـوو و سـەرقاڵی داگرتنـی بـوون منیـش بـۆ گاڵتـە و خۆشـی تەنها پرسـیارێکم لـێ کـرد گوتـم (بەڕاسـت تەنەکـەی ڕۆن بـۆ ڕەنگـی زەردە ئـەی ڕەنگـی تـری نیـە؟) ئیتـر ئـەو پرسـیارە بـووە بیانـوی گرتنـی مـن و وا سـاڵێکە لێـرەم، لەراسـتیدا ئـەوە دووەم جـاری بـوو بیگـرن و بیهێننـە زیندانـی ئاکـرێ، گوتـم باشـە بـۆ پێـی تـوڕە دەبیـت، ئـەوە

کەی عەیبەیە یان چ شەرمێکی تێدایە؟! ئەو گوتی، کە تازە هاتمە ئێرە چەند کەسێك لێیان پرسیم بۆ گیراوی؟ گوتم لەسەر تەنەکە رۆنی زەرد ئەوانیش لەسەریان کردم بەنوکتە و چەند چیرۆکێکی جیاجیاشیان لەسەر دروستکرد بۆیە پێی نیگەران دەبووم.

رۆژی جیهانیی مافی مرۆڤ بوو، هەرچەندە بۆ ئێمە بەندەکانی جارنامەی مافی مرۆڤ مانایەکی نەدەبەخشی، لەو زیندانە ئەوەی نرخی نەبوو مرۆڤ بوو، چونکە زیاتر لە هەزار و پێنج سەد کەسی تێدابوو و ئەو هەزار و پێنج سەد کەسە لەلایەن سی بۆ چل کەس هەموو رۆژێك ئەشکەنجەی جەستەیی و رۆحی دەدران، رۆژانە تەنها بۆ ئەوەی هەست بە مرۆڤبوونی خۆمان نەکەین، ئەگەر هیچ شتێکیان بەرامبەر نەکردینایە ئەوا نەوتیان دەکردە خواردنەکانمان، بۆ ئەوەی نەتوانین بیخۆین. ئێمە تا ئێوارە نەمانزانی رۆژی جیهانی مافی مرۆڤە، وەك هەمیشە ئێوارەی هەمان رۆژ، کە هاوکات بوو لەگەڵ رۆژی جیهانیی مافی مرۆڤ، گوێمان لە رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق گرتبوو، کە زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، لە سەردێڕی هەواڵەکان گوتی کاك مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیموکراتی کوردستان، بە بۆنەی رۆژی جیهانیی مافی مرۆڤ لە پەرلەمانی کوردستان وتارێکی پێشکەش کرد، گوێمان لە وتارەکەی کاك مەسعود بارزانی گرت، زۆر باسی لە پاراستنی مافی مرۆڤ و رێزگرتن لە بەها

مرۆڤایەتییەکان کرد، ئامـاژەی بـەوەدا کـە پێویستە مافی مـرۆڤ پێشـێل نەکرێـت، ئـەو گوتـی مـن دەزانـم لـە زیندانەکانـی ئێمـە مافی مـرۆڤ پێشێلکراوە، لەمـرۆوە بزانـم لـە هـەر زیندانێـك مافی مـرۆڤ پێشێل دەکرێـت خـۆم بـە شەخسی لێپێچینـەوەی لـێ دەکەم و بەڕێوەبـەر و ئەوانـی پێشێلی مافی مرۆڤیـان کـردووە سـزایان دەدەم. نزیکـەی کاتژمێرێـك بەسـەر پەخشـکردنی وتارەکـەدا تێپـەڕی، کـە دەنگی کردنـەوەی قوفڵی دەرگای هۆڵەکەمـان هـات، نـاوی چـوار کـەس خوێندرایـەوە، یەکێـك لـەو چوارکەسـانە مـن بـووم، ئێمەیـان بـردە بەردەرگا و بـە دوانـزە کـەس کەوتنـە گیانمـان، ئەشکەنجەیەکیاندایـن کـەم جـار ئەشـکەنجەی وام بینـوە، کـە زیاتـر لـە نیـو کاتژمێـری خایانـد و تێکـڕای پاسەوانەکانیش بەشـدار بـوون، دوای ئێمـە یەکـە یەکـە دەرگای هۆڵەکانـی تریـش کرایـەوە و لـە هـەر هۆڵێـك چەنـد کەسێکیان هێنایە دەرەوە و بە هەمان شێوەی ئێمە ئەشکەنجەیاندان، دوای تەواوبوونیـان لـە لێدانـە بـێ بەزەییەکەیـان ئەفسـەرێکیان بـە هەناسـە بڕکـێ، کـە هیلاك بـوو بـوو بـە لێدانـی زیندانیـان، هاتـە بـەر پەنجـەرەی هۆڵەکـە و بەدەنگێکـی بـەرز گوتـی هیـوادارم تێگەیشـتبن، دڵـی خۆتـان بـە قسەکانی کاك مەسعود خـۆش نەکـەن، ئـەوە بزانـن کـە ئـەو بڕیـارەی کاك مەسـعود ئێـرە ناگرێتـەوە!. بەوشـێوەیە و زۆر بـە روونـی پێیـان گوتیـن کـەس هەوڵـی ئـەوە نـەدات سـود لـە پەیامەکـەی کاك مەسـعود وەرگـرێ، ئێمـە هـەر کاتێـك بمانـەوێ دەتوانیـن وردو خاشـتان بکەیـن، ئـەو شـەوەش مـن یەکێـك بـووم لـە

قوربانییەکانی گەیاندنی پەیامە توندوتیژەکەی ئەوان.
بەردەوام سەرنجم دەدا پاسەوانەکان کەسێکی عەرەبیان دەهێنایە دەرەوە دەکەوتنە گفتوگۆ لەگەڵی و بەهەموو هێزی خۆیان قاقایان لێدەدا، ئەو دیمەنانە بۆمن زۆر سەرنجڕاکێش بوون. لەهەڵسوکەوتی هیشام دیار بوو، کە باری دەروونی باش نەبوو، هەڵسوکەوتی سەیر و سەمەرەی دەکرد. هەر ماوەیە و لە هۆڵێك بوو، رۆژێك هێنایان بۆ هۆڵەکەی ئێمە، هەر زوو تێگەیشتم، کە هیشام باری دەروونی زۆر ناتەواوە. رۆژێك لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێکانم باسی شوێنی لەدایکبوونمان دەکرد، هیشام گوێی گرتبوو بۆ قسەکانی ئێمە، من گوتم دایکم و باوکم دەڵێن لە ناوەڕاستی عێراق لە دایکبوویت. ئەوکاتەی جەلال بەگی باپیرم لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە رادەستی عێراق دەکرێتەوە دەوڵەتی عێراق نامەیەك بۆ کەسوکاری باپیرم و ئەو دوانزە هاوڕێیەی دەنێرن، کە لەگەڵ ئەو رادەستی عیراق کراونەتەوە و داوایان لێدەکەن، ئەگەر بیانەوێ لەسێدارەیان نەدەن پێویستە کەسوکاری گیراوەکان وڵاتی ئێران جێبێڵن و بگەڕێنەوە. سەرکردایەتی شۆڕش ئەمر بە باوکم و کەسوکارەکەی دەکەن بۆ پاراستنی گیانی باپیرم بگەڕێنەوە عێراق، دوای گەڕانەوەیان دوور دەخرێنەوە بۆ ناسریە، کە ناوی ناسریەم هێنا هیشام سەری هێنایە پێشتر و گوتی بۆ باسی ناسریە دەکەن من خەڵکی ئەوێم، ئیتر ئەو گفتوگۆیەی ئێمە دەرگای لەسەر دواندنی هیشام کردەوە. کەوتینە پرسیارکردن کە بۆ گیراوە؟

ئەو زۆر بە تێکەڵی و بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ تێیگەیاندین، کە لە ساڵی ١٩٨٢، لە یەکێک لەشەڕەکانی نێوان عێراق و ئێران بە برینداری، کە گوللەیەك بەر سەری دەکەوێت کەوتۆتە دەست سوپای ئێران، دوای پانزە ساڵ وا پێدەچێت بەهۆی تێکچونی باری دەرونی، حکومەتی ئێران هیشام و چەند پەککەوتەیەکی تری دیلی عێراقی دەهێنێتە سنوری حاجی ئۆمەران و ئازادیان دەکات، بەڵام لەوێش جارێکی تر دەستگیری دەکەنەوە و ئەوە هەشت مانگە خۆیشی نازانێت لە زینداندایە یان لە کوێیە. ئەو بەسەرهاتەی هیشام زۆر کاریگەر بوو، چەندین بیرکردنەوەی هێنایەوە پێش. پرسیارە بێ وەڵامەکانمان لە خۆمان دەکردەوە، هیشام کەسوکاری وا دەزانن کوژراوە، یان وەك بێسەروشوێن تۆمار کراوە، ناونیشانی ماڵی خۆیانی بیر نەماوە، تەنانەت نازانێ کێ لەکەسوکارەکەی ماوە، هیچ کەسێك لێی ناپرسێتەوە و هەست بە هیچ شتێك ناکات. ئەو تەنها ئەوە دەزانێت، کە گوللە بەر سەری کەوتوە، وا دەزانێت هێشتا لە ئێرانە و دەشزانێت خەڵکی ناسریەی خوارووی عێراقە. ئیتر ئەمە هەموو پێناسەی مرۆڤێك بوو، کە خرابووە زیندانێکی سیاسی و هیچ لێکۆڵینەوەیەکیشی لەگەڵ ناکرێت و تەنانەت نایبنێرنە نەخۆشخانەیەکیش، بۆئەوەی هەوڵبدرێت باری دەرونی ئارام بکرێتەوە و لانی کەم وەك مرۆڤێکی ئاسایی و تەندروست بژیت.

خەمەکانی زیندان نەبڕاوە بوون، کەم شەو هەبوو لە خەو

رانەپەڕم، بە جەستە لەنێو زیندانـدا بووم و بە رۆحیش هێشتا بەرەنـگاری شـەپۆلەکانی دەریـا دەبوومـەوە، زۆرجـار و تـا ئێسـتاش بەدەنگی نیاز خەبەرم دەبێتەوە و وا هەست دەکەم هێشتا بەدوای سافۆدا دەگەڕێت، هەمـوو رۆژێـك کارەسـاتێك بەسـەر زیندانیانـی ئەو زیندانـە رەشـەدا دەهات، هەمـوو رۆژێـك بیانوێـك دەدۆزرایـەوە بۆ دروستکردنی فشاری زیاتـر و ئەشکەنجەدانی زیاتری زیندانیـان، بـارودۆخ هێنـدە سـەخت بووبـوو، کـە بەڕاسـتی لـە تاقەتـی زۆر کەسـدا نەمابـوو، رۆژانـە هەوڵـی خۆکوشـتن و خـۆ سوتاندن هەبـوو، هەمووومـان بـە شـێوەیەك لـە ژیانـی خۆمـان بێـزار بوویـن، کـە هـەزار ئاواتمـان بـە مـردن دەخواسـت.

شـەوانی ئاکـریێ زۆر ناخـۆش و خەمهێنـەر بـوو، تاریکـی هۆڵەکـە و دیـوارە رەشـەکانی بەتـەواوی دڵـی مرۆڤـی تونـد دەکـرد، کـە ئێـوارە دادەهـات بێدەنگییەکـی سامناکیشـی لەگـەڵ خـۆی دەهێنـا، هیـچ کەسـێك تاقەتـی دەمەتەقێیەکیشـی نەبـوو، بەهـۆی تاریکیشـەوە کـەس نەیدەتوانـی سـەرقاڵی چنیـن و کارە دەسـتیەکان و یـاری کـردن بێـت، هەرکەسـە و لەسـەر جێـی خـۆی دادەنیشـت و دەچـۆ قوڵایـی بیرکردنـەوە، هیـچ کتێبێـك یـان بڵاوکراوەیـەك دەست نەدەکەوت تـا بیخوێنینـەوە، هـەر بۆیـە کاتێك رۆژنامەیەك بەهەر شێوەیەك دەهاتە ژوورەوە زیندانیـان نۆبەتیـان بۆدەگـرت و لەسـەرەتاوە دەمانخوێنـدەوە تـا کۆتایـی، ئـەوەش بـەردەوام نەبـوو، بەڵکو بەدرێژایـی ئـەو ماوەیـە چەنـد جارێـك رۆژنامـەی (برایەتی)مـان بـەردەسـت کـەوت.

یەکێـك لـە هاوڕێکانمـان، کـە خەڵکـی شـارۆچکەی چوارقوڕنـەی سـەر بـە قـەزای رانیـە بـوو، یەکێـك بـوو لـە کـوڕە قسـەخۆش و شـیرینەکانی زینـدان، ئـەو رۆژێـك لـە گفتوگۆیەکـی هاوڕێیانـە دەردە دڵـی خـۆی کردبـوو و بێـزاری خـۆی لـەو ئەشـکەنجە و کەرامـەت شـکاندنەی زیندانیـان باسـکردبوو، دوای دوو رۆژ ئەویـان بـردە دەرەوە و ئەشـکەنجەیەکی زۆریانـدا، دوای ئـەوەی هێنایانـەوە ژوورەوە بڕیاریـدا مـان لـە خـواردن بگرێـت، هەرچـی هەوڵێکـی لەگـەڵ درا بێسـود بـوو. رۆژی دووەم و سـێیەم زۆر فشـاری خرایـە سـەر، بـە لێـدان و ئیهانـەش نەیانتوانـی مانگرتنەکـەی پـێ بشـکێنن، ئـەو بـەردەوام بـوو لـە مانگرتنەکـەی و ئێمـەش چاودێریمـان دەکـرد. هەرچەنـدە دەمانزانـی کـە مردنیـش هیـچ لەبارودۆخەکە ناگۆڕێت و تۆزقاڵێـك لـە زەبروزەنـگ و رەفتـارە تۆقێنەرەکانـی بەرێوەبەرانی ئەو زیندانـە ناگۆڕێـت، بۆیـە هەموومـان هەوڵمانـدەدا ئـەو مانگرتنەکـەی بشـکێنێت. هەوڵەکانمـان بـێ سـود بـوو و لەمـاوەی سـی و پێنـج رۆژدا تەنها ئێسـقانی لێمایـەوە و گەیشـتە سـەرە مـەرگ، تـا بێهۆش بـوو رازی نەبـوو مانگرتنەکـەی بشـکێنێت، کـە بێهـۆش بـوو دکتـۆر موحسـین هـات و چەنـد بتڵێـك ئـاوی بـۆ هەڵواسـی و نەیهێشـت گیـان لەدەسـت بـدات، هەرچەنـدە کـە هۆشـی هاتـەوە رازی نەبـوو، بـەڵام بـە هەوڵـی هەموومـان ئەومـان رازیکـرد کـە واز لـە مانگرتنەکـەی بێنێـت و وەك ئێمـە سـەبری هەبێـت.

دوای ئـەوەی ئـەو هاوڕێیەمـان مانگرتنەکـەی شـکاند و نەختێـك

کەوتــەوە ســەر پێــی خــۆی، شــەوێك، کەهەمووومــان چوینــەوە ســەر جێگەی خۆمـان بۆئـەوەی بخەویـن، لـە پـڕ دەنگێـك لـە نێـو هۆڵەکـە بـەرز بـۆوە و گوتـی کەسـتان مەخـەون دوو سـێ قسـە هەیـە دەمـەوێ بیکـەم، دەنگەکـە لـە لای خـوارەوەی هۆڵەکـەوە بـوو، بـەڵام چونکـە تاریـك بـوو کەسـمان بـە باشـی ئەومـان نەدەبینـی، بـەڵام بەدەنـگ زانیمـان کـە ئـەوە کێیـە· ئـەو یەکێـك بـوو لـەو زیندانیانـەی کـە هەمووومـان خۆمـان لێـی دەپاراسـت، بـەوە ناسـراوبوو، کـە قسـە دەبـات بـۆ پاسـەوانەکان· لـە راستیشـدا پـێ دەچـوو هـەر بـۆ ئـەوە هێنابێتیـان بـۆ ئـەو زیندانـە، چونکـە کەیسـەکەی سیاسـی نەبـوو و کوشـتنی ئەنقەسـت بـوو· خـۆی باسـی تاوانـە ڤێزەونەکـەی دەرهـەق بـە کەسـێکی نزیکـی خـۆی بـۆ بەشـێك لـە هاوڕێیـان کردبـوو، بۆیـە نـە کـەس خۆشـی دەویسـت نـە متمانەشـمان پێـی هەبـوو· ئـەو گوتـی گوێبگـرن دەزانـم چەنـد کەسـێکتان بەرنامەتـان هەیـە زینـدان بشـکێنن و رابکـەن، بەرنامـە و نـاوی تـەواوی ئـەو کەسـانە ئەوەتـا لـە گیرفانمدایـە و ڕێگـە نـادەم کاری وا بکرێـت· لـە راسـتیدا قسـەکانی لـە گاڵتەیەکـی تۆقێنـەر دەچـوون، سـەرەتا هەمووومـان وامانزانـی گاڵتـە دەکات، بـەڵام وادیـار بـوو زۆر بەڕاسـت ئـەو قسـانە دەکات· بـە چرپـە لەگـەڵ هاوڕێیـان کەوتینـە گفتوگـۆ پێمـان وابـوو ئـەو کەسـە بـاری دەرونـی تێکچـووە ئەگەرنـا کـوا لـەو شـوێنە سـەختە کـەس دەتوانـێ بیریـش لـە کارێکـی وا بکاتـەوە!· ئـەو شـەوە هەمووومـان لەژێـر بەتانیـدا بوویـن، بـەڵام هیـچ کەسـێك نەخەوتبـوو· هەمووومـان

دەمانزانی ئەوەی ئەو دەیڵێت ئەگەر بەدواداچوونی بۆ بکرێت و زانیارییەکەی لێوەرگیرێت، ئەوا تا ساغ دەبێتەوە چەندین کەس پێستیان لەسەر دادەماڵرێت. من زوو ترس کەوتە دڵم، بیرم کردەوە ئەگەر ئەوە بەرنامەی ئیدارەی زیندان بێت بێگومان ناوی منی تێدا دەبێت، ئەگەر خۆشی ئەو سیناریۆیەی دارشتبێت لەبەر ئەوەی من بەئاشکرا خۆم لێی دەپاراست و تێکەڵاوی نەدەبووم بەدڵنیاییەوە بۆ ئازاردانم ناوی منیشی لە لیستەکەیدا نووسیوە. رۆژ بۆوە و تەنانەت کەس نەیتوانی نانی بەیانیش بخوات، هەمووما لە چاوەڕوانی ئەوەدابووین، کە دەرگا بکرێتەوە و ئەو ناوانەی ئەو نوسیونی بانگ بکرێن. لەوە دەترساین ئەوە بەرنامەی خودی ئیدارەی زیندانەکە بێت و بیانەوێ چەند کەسێک بەو تۆمەتە لەناو ببەن. هەموو ئەگەر و بیرکردنەوەکان رێی تێدەچوو و دەمانزانی دەرباز بوون لێی سەختە ئەوەی نەمان دەزانی ئەوەبوو کە ناوەکان کێن. دوای نانخواردنی بەیانی ئەو کەسە برایە دەرەوە و پێش نیوەڕۆش دەرگا کرایەوە و دەستکرا بە خوێندنەوەی ناوەکان، شانزە کەس لە هۆڵەکەی ئێمە ناوی خوێندرایەوە، سێیەم ناو من بووم و دوای من ئەو هاوڕێیەمان بوو، کە چەند رۆژێک لەمەوبەر بەهۆی مانگرتنەوە تا لێواری مەرگ چوو. ئێمەیان بە لێدان و ئەشکەنجەدان بردە هۆڵێکی تر، کە هی چاوپێکەوتنی رۆژی سەردانەکان بوو، لەوێ کەوتنە گیانمان و ئەشکەنجەیەکی زۆریاندایین، تا درەنگانێکی ئێوارە لەوێ ماینەوە.

کاتێك ئێمه براینه دەرەوە، بەڕێوەبەر لەنێو حەوشە پیاسەی دەکرد، جامانەیەکی لە ملی ئاڵاندبوو و چاکەتێکی زەیتونی لەبەردابوو، ورگێکی گەورە و روخسارێکی تووڕە و بێ بەزەیی هەبوو، هەردوو دەستی خستبۆ پشتەوە و لەبەردەم ئێمە دەچوو و دەهات. زۆر تووڕە هەرچەندە ئەو ئەشکەنجەدانە بە بیانوێکی زۆر بێمانا بوو و کەس ئاگاداری کارێکی وانەبوو و نەشماندەزانی بۆ ئەوکەسە کارێکی لەمشێوەیەی کرد.! ئێمەیان دانیشاند و بەدەنگێکی زۆر بەرز، کە هەموو هۆڵەکانی زیندان گوێیان لێبوو، گوتی با پێتان بڵێم من بڕوا بەوە ناکەم ئێوە بیرتان لەکارێکی وا کردبێتەوە و هەوڵتاندابێ زیندان بشکێنن، بەڵام ئەگەر کەسێك بیەوێ بیر لە شتێکی وا بکاتەوە ئێمە زۆر خێرا پێیدەزانین و بەر لەوەی بیدرکێنێ لەنێو ئەو حەوشەیە پارچە پارچەی دەکەم بە دەستی خۆم. ئەو وا قسەی کرد، کە هێشتا ئێمە قەرزداری ئەوین، لەگەڵ ئەوەی خۆی بڕوای بە تۆمەتەکە نەبوو کە درابۆ پاڵ ئێمە. ئیتر ئەو قسانەی کرد و ئێمەش خواخوامان بوو لێی رزگار بین، بۆیە دوای چەند خولەکێك بردنیانەوە هۆڵەکەی خۆمان. دوای ئەوەی چوینەوە ژوورەوە وێڕای ئەوەی ئەشکەنجەیەکی زۆر درابووین، بەڵام هێشتا دڵخۆش بووین کە بەوەندە رزگارمان بووە، چونکە ئێمە بە پیلانێکی گەورەتر دەمانبینی. ئیتر لەو رۆژەوە کەس بڕوای بە جاسوسە بێویژدانەکە نەما و کەسیش هاوڕێیەتی نەکرد، بۆیە دوای ماوەیەك خۆی داوایکرد کە بیگوازنەوە بۆ هۆڵێکی تر و لای

ئێمە ئەما٠

کۆتایی زستان بوو، بێ ئومێدییەکی زۆر لای هەمووومان دروست بوو، هەفتانە بە دەیان کەسیان بۆ زیندانەکە دەهێنا و تاك تاکە ئازاد دەکران، ئارەزووی خەوێکی بە ئیسراحەت و پشوێکی دوور لە ژاوەژاو و خواردنەوەی چایەك بە پیاڵە و خۆشوشتنێکی بێ قەید و شەرت و پیاسەیەکی ئێواران، خەون و خەیاڵی هەمووومان بوو، لەراستیشدا ئەو خەونانە بۆ ئێمە گەورەبوون، بەڵام بۆ وڵات و شوێنێکی تری جیا لە وڵاتی ئێمە، ئەوە مافێکی زۆر سەرەتایی و سروشتیی هەموو مرۆڤەکانە، یەکێك دەیگوت ژیان دەرفەتی پێدابام جارێکی تر گەیشتبامەوە باوەشی دایك و باوکم، یەکێکی تر دەیگوت کەی بێ کۆتایی بە چاوەڕوانی منداڵە بێنازەکانم بێت؟ یەکێك بیری لای خۆشەویستەکەی بوو و هەموو رۆژێ یادی دەکرد و شعری بۆ دەنووسی، یەکێك دەیگوت کەی بێ هەمووومان بچینەوە سەر سفرەی ماڵباتەکانمان؟! ئازادی بۆ ئێمە هیوایە گەورەکە بوو، دەمانزانی ئەو رۆژەی ئازد بکرێین ئەو خەونانە ئەستەم نین و دەتوانین بیان هێنینە دی، دڵی یەکترمان دەدایەوە، بەڵام هەمیشە ئەو دڵدانەوە و هیوا و ئاواتانە بەیەك دێڕ دادەخران ئەویش پرسیاری (کەی ئازاد دەبین!)بوو، لەراستیشدا وابوو کەس نەیدەزانی کەی و چۆن ئازاد دەبین، چونکە ئێمە نە دادگامان بینیوە و نە دادوەر، نە فەرمانی گرتن و نە دیاری کردنی رۆژی تەواوبوونی سزا! هەمووومان چاوەڕوانی

قەدەر بووین، چاوەڕوانی موعجیزەیەکی ئیلاهی بووین، کە ئازاد بکرێین، چونکە نە دەنگوباسی ئاشتەوایێك هەبوو نە هەوڵکی ناوخۆیی و دەرەکیشمان بینیبوو بۆ ئازادکردنی ئێمە.

ئێوارەیەك بەو بێ هیواییە گوێمان لەدەنگوباسی رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق دەگرت، گوێگرتن لە دەنگوباسی ئەو رادیۆیە ئیجباری بوو و نەدەبوو هیچ کەسێك قسە بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەمومان گوێمان لێدەگرت و بە تاسەوە چاوەڕوانی هەواڵەکان دەبووین، بۆ ئێمە گوێگرتن لە هەواڵەکان کارێکی باش بوو، چونکە دڵمان بەوە خۆش دەبوو، کە لە هەواڵەکاندا هەواڵی هاتنی شاندە بیانییەکانی دەخوێندەوە دەمانگوت رەنگە ئەو شاندە باسێکیش لە ئاشتی بکات و دەرگایەك بکرێتەوە، کە رۆژێك بێت ئێمە لێی بچینە دەرەوە، هەر هەواڵێك لەبارەی ئاشتییەوە بڵاو دەکرایەوە کۆڵێك هیوا و ئومێدی لا دروست دەکردین. ئەو رۆژە کەسمان چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش نەبووین، کەچی یەکەم هەواڵی رادیۆ هەمووومانی شۆك کرد، بەشێوەیەك لە چرکەیەکدا خۆشیی بە روخساری هەمووومانەوە دیار بوو، لەوپەڕی بێ هیواییەوە پەیامی هیوا هات، سەیری هەر کەسێکت دەکرد روخساری لە گوڵی گەشاوە دەچوو و بەهەر جۆرێك بوایە دڵخۆشی خۆی بۆ نیشان دەدای، سەردێڕی یەکەم هەواڵ وتی (مام جەلال تاڵەبانی نامەیەکی ئاراستەی کاك مەسعود بارزانی کرد بۆ دەستپێکردنەوی گفتوگۆی ئاشتی)، دوای ئەو سەردێڕە چەند سەردێڕێکی تری خوێندەوە،

هیچ کەس لە و سەردێرانەی تر تێنەگەیشت، چونکە پەلەمان بوو بزانین ناوەرۆکی نامەکە چییە؟ دوای ماوەیەکی کەم دەقی نامەکە خوێندرایەوە، نامەکە پرۆژەیەکی پێشنیارکراو بوو بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ئاشتی، یەکێك لە خاڵە گرنگەکانی نامەکە باسی لە بەپەلە ئازاد کردن و گۆڕینەوەی گیراوانی هەردوولا دەکرد، ئەو هەواڵە لە گەرمەی نائومێدی و بارودۆخێکی زۆر سەختدا بڵاو کرایەوە، هەموومان دڵخۆش و شادومان بووین، بەڵام چاوەڕوانی هەڵوێستی کاك مەسعود بارزانیش بووین و پێمان وابوو نابێ پەلە بکەین و دەبێ کاردانەوەی ئەویش ببینین. دوو رۆژ دواتر لە هەمان رادیۆ گوێبیستی وەڵامەکەی کاك مەسعود بارزانییش بووین، کە بریتی بوو لە رازیبوون بەو پرۆژەیە و ئامادەیی خۆی و پارتەکەی نیشاندابوو بۆ گفتوگۆی جدی، ئیتر دڵخۆشی ئێمە سنوری نەما و هیوایەکی گەورەمان لا دروست بوو و دڵنیا بووین لەوەی لە نزیکترین کاتدا دەرگا بەرووماندا دەکرێتەوە و ئازاد دەکرێین، ئێمە لەسەرەتای بەندکردنمان دەمانزانی کلیلی ئازادبوونمان ئاشتەواییی نێوان هەردوو حزبی بەشەڕهاتووە، لە ئاشتیدا هیوا و ئومێد چەکەرە دەکات وەك بینیشمان لەکاتی شەڕیشدا جگە لە زیانە گیانی و مادیەکانی بەیەکتری دەگەیەنن ژیانی ئێمەی بەند کراویش دەبێتە دۆزەخ و ئەوەی سودمەندیش دەبێت، تەنها بازرگانانی شەڕ و شەڕخوازەکان و دووژمنانی ئەم خاك و میللەتەن.

یەکەم کۆبونەوەی نێوان مام جەلال و کاک مەسعود ئەنجامدرا و لیژنەی باڵای ئاشتی پێکهێنرا و کۆبوونەوەکانی لیژنەی باڵای ئاشتی دەستپێکران، سەرەتا زۆر بەگەرم و گوڕی کۆبوونەوەکان بارێوەدەچون، ئێمەش پەلەی ئەوەمان بوو ئاخۆ کەی لەیەکێک لەکۆبوونەوەکان رێککەوتنی تەواو لەبارەی بەندکراوەکان دەکرێت و مژدەی ئازادبوونمان پێ دەدەن، سەرەتای مانگی سێ ئامادەکارییەکان بۆ ئازادکردنی بەندکراوەکان دەستی پێکرد، هەواڵی جۆراو جۆر دەهاتنە نێو زیندان، هەریەکە و بە شێوازێك بۆچوونی خۆی دەردەبڕی لەبارەی چۆنیەتی ئازادکردنمان، هەندێك پێیان وابوو سەرەتا دیلەکانی شەڕ ئاڵوگۆڕ دەکرێنەوە، هەندێکش دەیانگوت کۆن و نوێ لەبەرچاو دەگیرێ، چونکە هەندێك کەس ساڵانێکە لە زینداندان و هەندێکیش چەند مانگێکی کەم، بۆیە کۆنەکان زووتر ئازاد دەبن. سەرەنجام لە یەکێك لەکۆبوونەوەکان رێککەوتبوون، کە وەك نیەت پاکی لەبەرامبەر یەکتریدا گروپێك لە بەندکراوەکان بگۆڕنەوە، بۆچوونەکانی ئێمەش لەسەر شێوازی گۆڕینەوەکە و کێ پێش دەخرێت و کێ دوا دەخرێت هیچیان وا دەرنەچوون، یەکەم گروپ کە لەشەست کەس پێکهاتبوون کەس نەیزانی بە چ پێوەرێك ناویان گەڕاوەتەوە، رۆژێك ناویان خوێندرایەوە و هەر ئەو رۆژە گوازرانەوە و بە شێوازی گۆڕینەوە ئازاد کران، لەو گروپەدا ناوی منی تێدا نەبوو، بەڵام دڵگران نەبووم و پێموابوو، کە نۆبەتی ئێمەش دێت و درەنگ یان زوو ئێمەش ئازاد دەکرێین. پێشتر

پێیان ڕاگەیاندبووین، کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا هەمووومان ئازاد دەکرێین، دوای ئەو گروپە، پرۆسەی ئازاد کردن و گۆڕینەوە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ پەکخرا و ڕاگیرا، ئەو ماوەیەش جارێکی تر زیندان بارودۆخەکەی گۆڕایەوە و خراپتر بوو لە پێش ئازاد کردنی وگروپی یەکەم و جارجارەش چەند کەسێك دەگیران و دەیانهێنانە لای ئێمە، ئەوەش وایکردبوو بڕوامان بە پرۆسەی ئاشتی کەم بێتەوە و بێ هیوا بین. ئەو هاوڕێیانەم، کە چەند ساڵێك پێش من گیرابوون، بەردەوام باسی ئەزموونی دوو ساڵ لەمەوبەریان دەکرد. ئەوان دەیانگوت جارێکی تریش پرۆسەی ئاشتی بەرەو پێشچوو و چەند کەسێك بە شێوازی گۆڕینەوە ئازاد کران و دوای ئەوان جارێکی تر بارودۆخەکە تێکچۆوە و هیچ کەسێکی تر ئازاد نەکرا، ئەوان پێیان وابوو مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، ئەو بەسەرهاتانە بەتەواوی بێزاری دەکردین و هیوامان لەدەست دەدا، لەراستیشدا نیشانەکان هەمان ئەو نیشانانە بوون کە هاوڕێیان باسیان لێوە دەکرد، بۆیە ڕۆژ بەڕۆژ بێ هیوا دەبووین.

لەگەڵ ئەوەی گفتوگۆی نێوان یەکێتی و پارتی درێژەی هەبوو و ڕۆژانە کۆبوونەوەی لیژنەکان هەبوو، بەڵام گۆڕانکارییەکی ئەوتۆ بەسەر هەڵسوکەوتی پاسەوانان و شێوازی ئیدارەدان و کەمبوونەوەی ئەشکەنجەدان نەهات. لەو سەروبەندی پرۆسەی ئاشتییەدا لە ڕادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق گوێبیستی هەواڵێك بوین، کە کۆماری

ئیسلامی ئێران چەند کادیرێکی پارتی دیموکراتی کوردستانیان بە تۆمەتی ئەندام بوون لە دەزگای هەواڵگری ئیسرائیل دەستگیر کردووە و یەکێک لە کادیرە دیارەکانیشیان لە سێدارە داوە، دوای بڵاو بوونەوەی ئەو هەواڵە لە هەر هۆڵە و چەند کەسێکیان بردە دەرەوە، من یەکێک بووم لەو کەسانە، وەك ئەوەی ئێمە خەڵکی ئێران بین یاخود سەر بە دەزگای هەواڵگری ئەو وڵاتە بین، بە درندانەترین شێواز ئەشکەنجە دراین، یەکێك لە پاسەوانەکان زۆر درندانە چەندینجار لەسەریەك مشت و زللەی کێشا بە ناو چاومدا و لەگەڵ هەر بەرکەوتنێك بڵێسەی ئاگرم دەبینی لە نێو چاوم، دوای ئەوەی ئێمەیان بردەوە ژوورەوە  هەستم بە ئازارێکی زۆری چاوم دەکرد، دەمزانی کە چاوی چەپم بینایی نەماوە، لەو کاتانەشدا کەس بۆی نییە لە نێو هۆڵەکە هەستێت و جموجۆڵ یان قسە بکات، دەبێ هەموو چوار مەشقی روو لە دیوار دانیشن، دوای ماوەیەك بارودۆخ ئارام بۆوە، بە یەکێك لە هاورێکانم گوت پێویستە دکتۆر موحسین ببینم، ئەوکاتە لەگەڵ دکتۆر موحسین لەیەك هۆڵ بووین، بەڵام ئەو لەوسەری هۆڵ و منیش لەمسەری بووم، هاورێکەم خۆی گەیاندە دکتۆر موحسین و پێیگوت کە من بارودۆخم باش نییە، دکتۆر موحسین هات و پشکنینی بۆ چاوم کرد، سەیرێکی کرد و گوتی ئێستا بە باشی نابینم هەم تاریکە و هەمیش چاوت زۆر سوور بۆتەوە تا بەیانی رەنگە چاویشت باشتر بێت، تا بەیانی زۆر کام خەوم لێکەوت باهۆی ئازاری زۆری

چاوم کە رۆژ بۆوا هەستمکرد زۆر خراپترم جگە لەوەی هیچ نابینم چاویشم بە تەواوی ئاوساوە، دیسانەوە خۆم گەیاندە لای دکتۆر موحسین و سەیرێکی چاوی کردم، ئەو زۆر ترسا و گوتی چاوت توشی هەڵدڕان و خوێن بەربوون بووە خوا رەحم بکات، تێگەیشتم کە پێدەچێ چاوێکم لەدەستدابێت، دکتۆر موحسین ئەو رۆژە تەکلیفی زۆری کرد و داوای چەند دەرمانێکی بۆ کردم، ئێوارە بۆیان هێنا و خۆی بۆی بەکار دەهێنام، دوای چەند رۆژێك هەستم بە بینین و باشتر بوونی چاوم کرد، ئەوەی سەیر بوو ئەو شەوە هیچ تۆمەت و بیانوییێك نەبوو بۆ ئەشکەنجەدانی ئێمە، بەڵام تێگەیشتین کە دەیانەوێ تۆڵەی ئەندام و کادیرەکانیان لە ئێمە بکەنەوە، راستییێکی تریش ئەوە بوو کە ئەوان هەمیشە چێژیان وەردەگرت لە ئەشکەنجەدانی زیندانیان، بۆیە هەواڵی دەستگیرکردن و لەسێدارەدانی کادرانیان بیانوەك بوو بۆ تێرکردنی ئەو حەزە زۆرای کە هەیان بوو ئەوویش ئەشکەنجەدای ئیمەی زیندانی بوو

لەو رۆژە سەخت و ناخۆشانەدا هیچ شتێك هێندەی هەواڵی ئازیزان و سەردانی ئەوان بۆ لامان ئارامەمان ناکاتەوە، بۆیە هەمیشە چاومان لە رێی کەسوکار بوو. من دوای ئەو ئەشکەنجە زۆرەی ئەم دواییە بەتەواوی لە ژیانی خۆم بێزار بووم، نەمدەزانی دەبێ چی بکەم، خۆ لەم چوار دیوارە رەش و نەفرەت لێکراوە هیچ دەسەڵاتێکم نیە، جگە لە دان بەخۆداگرتن نەبێ. چەند رۆژێك دوای

ئەشکەنجەکە، هەم باری تەندروستیم نەختێك باش بۆوە هەم لە رووی دەروونیشەوە بە هاوکاری هاوڕێیانم باشتر بووم، بەڵام هێشتا کاریگەرییە خراپەکانی ئەو ئەشکەنجە زۆرە بەسەرمەوە مابوو. ڕۆژی چاوپێکەوتنی گشتی هات، کە ئەگەر بارودۆخ ئاسایی بوایە و شەڕ نەبوایە ئەوا هەموو سەرەتای مانگ و ١٠ی مانگ و ٢٠ی مانگ سەردانی گشتی هەبوو بۆ زیندان. ٢٠ ی مانگ کاتژمێر ٨ی بەیانی سەردان کرایەوە، پێش نیوەڕۆ بانگ کرام کە سەردانم هاتووە، کەچوومە ژووری سەردان، پورەکانم لەهەولێرەوە هاتبوون بۆلام و چاوەڕێیان دەکردم. ماوەیەکی زۆر کەممان هەبوو، کە تەنها حەوت خولەك بوو، لەو کاتە کەمەدا بە دزییەوە بارودۆخی خۆم پێ گوتن. هەواڵی کەس و کاریشم لەوانەوە بیست و کاتی سەردانەکە کۆتایی هات. کۆمەڵێك پێداویستی و خواردنیان بۆ هێنابووم، ئەو سەردانەی ئەوان بۆمن زۆر زۆر گرنگ بوو، لە رووی دەروونییەوە بەتەواوی ئارامی کردمەوە، بەتایبەت کە ماوەیەکی دوور و درێژ بوو ڕێگەیان نەدابوو هیچ کەسێك بێتە سەردانم. کە چوومەوە ژوورەوە هاوڕێکانم بەتەواوی هەستیان بە دڵخۆشی من کرد. چومە شوێنەکەی خۆم و دەستمکرد بە کردنەوەی ئەو شتانەی بۆیان هێنابووم، لەنێو کەلوپەلەکان کێکێکی گەورەی تێدابوو کە خرابووە نیو ڕۆژنامەیەك و بە باشی پێچرابوو. ڕۆژنامەکەم کردەوە لەسوچێکی ڕۆژنامەکەدا چەند دێڕێك نووسینم بینی، نووسینەکە هی پورزایەکم بوو، ئەو جگە لەوەی کچە پورمە زیاتر هەستی

خوشك و هاوڕێیەكی زۆر نزیكم بۆی هەبوو، نامەكەی كە لەسەر ڕۆژنامەكە نووسیبووی چەند دێڕێك بوو، هیوای خواستبوو ئەو كێكە دوا خواردنم بێت لە زیندان و ئازاد بكرێم. ئەو دێڕانەی سازان هێندەی تر باری دەرونی ئارام كردمەوە و هەستێكی ئێجگار خۆشی پێ بەخشیم.

دوای ئەو هەمموو ئەشكەنجە و فشارە زۆرەی خرابووە سەر من، كەسوكارم پێیانزانی، هەوڵی زۆریان دابوو، كە دیل بەدیل بمگۆڕنەوە لە ڕێی حزبی شیوعی كوردستانەوە، كە هەوڵەكانیش لەڕێی هاوڕێ (شەپۆل فەتحی كەریم)ەوە بوو، كە ئەوكاتە ئەندامی سەركردایەتی و بەرپرسی كۆمیتەی محەلی ئازادی حیزبی شیوعی بوو لە ڕانیە، چونكە ئەوكاتە پارتی بچوكترین دەرفەتی بۆ من نەهێشتبۆوە نە بۆ ئازادبوون و نە بۆ ئەوەی كەمێك فشارەكانم لەسەر كەم بكەنەوە. بەڵام هەركاتێك برادەرانی حیزبی شیوعی هەوڵێكیان دەدا، ئەو بڕیار بەدەستانەی منیان زیندانی كردبوو هەمیشە ڕەتیان دەكردەوە یان ناوی كەسێكیان دەوت، كە لە ژیاندا نەمابوو وەك بەدیلی من. بۆیە كەسوكاریشم لەهەوڵی ئەوەدابوون، كە بەهەر شێوەیەك بێت ئەگەر نەشتوانن ڕزگارم بكەن، بەڵام كارێك بكەن كە ئەو ئەشكەنجە و فشارە لەسەر من كەم بكەنەوە. دوای بەدواداچونیان بۆیان دەركەوتبوو، یەكێك لە ئامۆزاكانی بەڕێوەبەری زیندانی ئاكرێ لەیەكێك لە شەڕەكان لەلایەن یەكێتییەوە بەدیل گیراوە. ئەوان وایان بە باش زانیبوو،

کە ئەو بکەنە بەدیلی من، هەر واشیانکرد و چوبوون ڕەزامەندیان لە سەرکردایەتی یەکێتی وەرگرتبوو، کە ئەو کەسە بکرێتە بەدیلی من و گواستبویانەوە یەکێك لە زیندانەکانی فیرقەی چوارقوڕنە· هەر زوو لەرێی خزمێکمەوە ئەو هەواڵەیان نارد بۆ بەڕێوەبەری زیندانی ئاگرێ و براو کەس و کاری دیلەکەی لای یەکێتی و پەیامێکیان پێدابوون، کە هەر ئازاردانێکی من ئۆباڵەکەی دەبێ بگرنە ئەستۆ· لەراستیدا هەر ئەو رۆژەی هەواڵەکە گەیشتە ئەوان بۆ من بارودۆخەکە گۆڕا، ئەو زەبروزەنگەی لەسەرم بوو تا رادەیەك کەم بۆوە و چیتر بێ هۆکار ئەشکەنجە نەدەدرام· هەموو هاوڕێکانیشم دەزانن، کە من هیچ کاتێك هەڵسوکەوتێکی وام نەدەکرد کە ببێتە هۆی ئەشکەنجەدانم، چونکە خۆم ئەو راستیەم باش دەزانی کە ئەوان هەمیشە بەدوای بیانوێکدا دەگەڕێن تا رقی خۆیان بەسەر مندا برێژن· وەك چۆن جاسوسەکە سیناریۆی دارشت و کۆمەڵێك کەسی بە لێداندا منیشی بەرکەوتم· باوکم و مامم چاوپێکەوتنیان لەگەڵ کرابوو، من ئەشکەنجە درام، کادیرەکانیان گیران و لە سێدارە دران من ئەشکەنجە درام، بەبۆنەی رۆژی جیهانی مافی مرۆڤ دیسانەوە ئەشکەنجە درام و دەیان جاری تر بێ هۆکار ئەشکەنجە درام و خرامە ژووری تاکە کەسی· من ئەو هەواڵانەم بە خێرایی پێدەگەیشت، تەنانەت رۆژێك بەڕێوەبەر بانگی کردم و شێوازی قسەکردنی گۆڕابوو· ئەو داوای لەمن کرد، کە سەردانێك بۆ خێزانی ئامۆزاکەی رێك بخەم کە بچێت

بیبینێ، چونکە پێدەچوو بڕوای تەواویان بەوە نەبێت کە پێیان گوتراوە. گوتم لێرە من چیم لەدەست دێت بیکەم؟ ئەوگوتی: کە سەردانت هات هەواڵێکیان بۆ بنێرە، کە ڕێگە بدەن خێزانەکەی بچێت بیبینێت. دوای دوو ڕۆژ چەند کەسێك هاتن بۆ سەردانم و منیش ئەو داواکارییەی ئەوانم کردە پەیامێك بۆ کەسوکارەکەم و پێمگوتن هەرچەند زووتر ئەو سەردانە ڕێکبخرێت، ئەوەندە زوو لێرە بارودۆخی من دەگۆڕێت. بۆیە هەر ڕۆژی دوایی پەیامەکەم گەیشتبووە کەسوکارەکەم و دوای دوو ڕۆژ پەیامی ئەوانیش هاتەوە، کە دەتوانن بچن بۆ دیداری. لە ماوەی یەك هەفتەدا ئەو دیدارە ئەنجامدرا، هاوسەری دیلەکە چوو و دوو ڕۆژ مایەوە و لە ڕانیەش لە ماڵی باوکم میوانداری هاوسەری دیلەکە کرابوو و زۆر ڕێزیان گرتبوو. هەردووك ڕۆژەکەش سەردانی دیلەکەی کردبوو و لە زیندانیش هاوکاری کرابوو و زۆر ڕێزیان گرتبوو. تەنانەت ڕۆژێك دیلەکەشیان هێنابوە ماڵ یەکێك لە مامەکانم. ئەوان ئەو دوو ڕۆژە هەموو کاتەکەیان پێکەوە بەسەر بردبوو و بۆ پشووی شەوانیش گەڕابووەوە ماڵی باوکم. دیلەکەی ئەوان پیاوێکی بەتەمەن بوو، بە خێزانەکەی گوتبوو، کە لە زیندان زۆر ڕێزی دەگیرێ و هیچ جۆرە ئەشکەنجەیەك نادرێ، دوای گەڕانەوەی، هاوسەری دیلەکە هاتە لای من و زۆر سوپاسگوزار بوو لەبەرامبەر ئەو خزمەتەی کردویانە و ئەو ڕێزەشی لە هاوسەرە دیلەکەی دەگرن. من ئەو قسانەی ئەوم بە دەرفەت زانی و گلەییم

لێکرد، کە کەسوکارم لەوێ ئاوا ڕێز لە ئێوە دەگرن، کەچی من لێرە فشاری زۆرم لەسەرە، ئەو گوتی کە هەوڵدەدەم کەسوکار و بەڕێوەبەر لەو گلەییانەی تۆ ئاگادار بکەمەوە، هەروا گوتی ئێمەش لێرە کەوتوینەتە خۆ، بۆ ئەوەی ڕەزامەندی وەرگرین، کە لەگەڵ تۆ بگۆڕدرێتەوە و ئازاد بکرێن. ئەو هەواڵانە بۆمن زۆر جێی دڵخۆشی و ئومێد بوون، بەو هۆیەشەوە وەك پێشتر ئاماژەم پێدا بەناچاری بەڕێوەبەر و پاسەوانەکان نەختێك زەبروزەنگیان لەسەر من کەم کردەوە، بەڵام وانەبوو کە بەتەواوی وازم لێبێنن. ئەو فشارە زۆرەی پێشتر خستبویانە سەرم تا ئەندازەیەك کەم بوبۆوە و وەك هەر زیندانیەکی تر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردم و سەردانیکردنی منیش ئاسایی بۆوە وەك تێکڕای زیندانیان. ئەوان زوو زوو دەچونە ڕانیە بۆلای کەس و کاری من و دیلەکەی خۆیان دەبینی.

لەوکاتەدا هێندە بیری دایکمم دەکرد، کە نەمدەزانی چیی بکەم، لەلایەك پڕ بەدڵ حەزم دەکرد بیبینم لە لایەکی تریش نەمدەویست لە زیندان و لەژێر بەرگی زیندانیدا بمبینێ. دواجار داوامکرد کە دەمەوێ دایکم ببینم و لە ڕێگەی کەسوکارمەوە هەواڵم بۆی نارد، کە بێت بۆ سەردانم. دوای زیاتر لە ساڵێك لە سەفەر و دەستگیرکرانم لە ڕۆژێکی گەرمی هاویندا دایکم و چەند کەسێك لە خزمانم هاتنە سەردانم، دوای نزیك بە ساڵێك لە دەستگیرکرانم ئەوە یەکەم سەردان بوو، کە توانیم بە ئاسودەیی

لەگەڵ کەسوکارم دانیشم. ئەو ڕۆژە دایکم زۆرێك لە کەسوکارمان لەگەڵی هاتبوون، بەتایبەت کە لەنێویاندا دایکم و پورم یەکەم جار بوو بیانبینم. ئەو فرمێسکەکانی قەتیس بوبون، بەڵام لەبەر من نەیدەویست بیانڕێژێ. من توشی شۆك بووبووم و بڕوام بە چاوەکانم نەدەکرد جارێکی تر دایکم ببینمەوە، توند دەستەکانیم گرتبوو، ناوەناوە باوەشێکی لێدەدام و بۆنی دەکردم، نە ئەو لەسەیرکردنی من تێر دەبوو نە منیش لە تێڕوانینی ئەو، حەزم دەکرد سەر بخەمە باوەشی و سەرخەوێك بشکێنم، دەمویست ماندویتی ڕێگا سەخت و ناخۆشەکەی نێوان باشوور و ڕۆژهەڵات، ڕۆژهەڵات و باکور، باکور و تورکیا، تورکیا و یۆنان و شەوە دوور و درێژەکەی دەریای ئیجە و شەوە تەنیاکانی زیندان و ئارەق و ئازاری دوای ئەشکەنجەی ساڵێك بەو چەند خولەکە لەباوەشی دایکم بڕەوێنمەوە. دەمەویست سەرخەوێك لە باوەشی دایکم بشکێنم نەبادا هێشتا ڕێگاکەم دوور و درێژتر و پڕ ماندویەتی بێت، بەڵام ئەو دەرفەتە کوا دروست دەبێ! ئەوکاتە کەمە کوا بەشی ئەو هەموو خەونە دەکات! چۆن دەتوانم ئەو کاتە کەمە لەنێوان دایکم و کەس و کارم و خەونەکانم دابەش بکەم؟! لەو دیدارە کورتەدا کە تێکڕای هەواڵپرسین بوو نەمتوانی هەگبەی لێوان لێو لە خەمەکانم بۆ دایکم بکەمەوە و ئەویش بە سۆزی خۆی بە لاوانەوە بیەوێ سارێژی برین و خەمەکانم بکات. چەند جارێك هەواڵی باوکم و باپیرم و کەسوکارم لێ پرسی، بەڵام هەر

گوتی هەموویان باشن خەمی تۆیانە و چاوەڕێی ئازادبوونی تۆن. ئەو رۆژە زۆر دڵیاندامەوە و دڵنیایان کردمەوە، کە لە نزیکترین کاتدا ئازاد دەکرێم، کۆڵێك هیوایان لە دڵمدا چاند.

دیدارەکەش کۆتایی هات و لەگەڵ دایکم و کەسوکارەکەم ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد، هەرچەندە یەکێك لە خزمەکانم لە رێی پەیوەندییە شەخسییەکانی داوای کاتی زیاتری کردبوو بەڵام زۆر زوو تەواو بوو. وامدەزانی چەند خولەکێکیش کەمتر بووە بەراورد بە چاوپێکەوتنەکانی پێشووترم. پاسەوانەکان گوتیان کات تەواو بوو و ئیتر لەگەڵ دایکم باوەشمانکردەوە بەیەکتریدا. نە من و نە دایکیشم نەماندەزانی ئەوە کام دیدارەیە، دیداری یەکەمە یان دوا دیدارە؟! کەی دەتوانین یەکتری ببینینەوە، ئایا لەدەرەوەی ئەو زیندانە نەفرەتییە جارێکی تر و بەم نزیکانە یەکتر دەبینینەوە یان لە هەمان شوێن! بەناچاری ئەوان کەوتنە رێ و رۆیشتن تا لە دەرگای دەرەوە ئاوا بوون من وەستام. ناوە ناوە دایکم ئاوڕێکی دەدایەوە و دەستێکی بەرز دەکردەوە، منیش بە هەردوو دەست ماڵئاوایم لێ دەکرد. لەراستیدا ئەو رۆژە بۆمن چەند خۆش بوو هێندەی خۆشییەکانیش سەخت بوو. سەخت بوو، چونکە دەمویست دایکم نەزانێ، کە چیم بەسەر هاتووە، نەمدەویست بەوە بزانێت کە تا چەند رۆژێك لەمەوبەر کوڕەکەی لە چ بارودۆخێکدا بووە. ئەو چەندین جار لێی پرسیم ئاخۆ ئەشکەنجە دەدرێم؟ من هەر بەگاڵتە وەڵامم دەدایەوە، کە بەهیچ

شێوەیەك ئازار نادرێم٠ لەلایەك دەمویست هەمـوو خەمەکانم لای دایکم باس بکەم و هەمـوو برینەکانمی نیشان بدەم، دەمویست پێی بڵێم بە چاوی چەپم باش ناتبینم تا بملاوێنێتەوە و خەم و ئازارەکانم لا کەم کاتەوە، بەڵام چۆن دەتوانم لەیەکەم دیداردا هەمـوو ئازارەکانی خۆمی بۆ باس بکەم و لەگەڵیدا بەش بکەم!٠
دوای گەڕانەوەی دایکم و کەس و کارم بەدڵێکی پڕ و قورگێکی پڕ لە گریان چومەوە ژوورەوە، تێکڕای هاوڕێیانم چاو ڕونی و پیرۆزباییان لێکردم، کە دایکمم بینیوە٠ بە سەرلەقاندن و هێما سوپاسم کردن، بەڵام بارودۆخی دەرونیم هێندە خراپ بوو، کە دەمویست بەپەلە بچمە سەر جێگاکەم و بکەومە بیرکردنەوەی خۆم٠ چومە سەر جێگاکەم و پاڵکەوتم، هێندە دڵگران بووم، کە نەمدەزانی لە دەوروبەرم چی دەگوزەرێ، ئەوکاتە پەشیمان بوومەوە لەوەی داوامکرد دایکم بێتە سەردانم، بەبەر خۆمەوە دەمگوت بۆ کارێکت کرد کە دایکم بە جلی زیندانیەوە بمبینێ!، من ئێستا ئاوا دڵتەنگم بە دیداری ئەو، ئەی دڵی ئەوی دایك دەبێ چۆن بێ!؟٠
چەند ڕۆژێك بەسەر سەردانەکەی دایکم گوزەرا و لە ڕۆژی سەردانی نوێدا (چیمەن)ی خوشکە گەورەم هاتە لام، ماوەیەك پێکەوە دانیشتین، ئەو خوشکەم زوو زوو دەهاتە سەردانم، ئەو ڕۆژە خەوم بە باپیرمەوە بینیبوو، خەوەکەم بۆی گێڕایەوە چاوی پڕ بوو لە فرمێسك و گوتی خوا لێیخۆشبێ، یەکسەر گوتم بۆ باپیرم کەی

کۆچی دوایی کردووە؟ ئینجا تێگەیشت، کە من نەمزانیوە، بەڵام ئیتر زانیم بۆیە گوتی لە سێی مانگی ئاداری ١٩٩٨ کۆچی دوایی کرد. ئەو هەواڵە بۆمن زۆر سەخت و ڕووخێنەر بوو، بڕستی لێبڕیم و توانای هیچم نەما، کە چومەوە ژوورێ بە بێدەنگی لەسەر جێگەکەم دانیشتم و دەستمکرد بەگریان، ئەمە چ ژیانێکە دوای چەند مانگێك لە کۆچی دوایی ئازیزترین کەست ئاگادار بکرێیتەوە، ئەمە چ ویژدانێکە لێنەگەڕێن لە شین و شایی ئازیزانت بەشدار بیت؟. هەرچەند هاوڕێیان دڵیاندامەوە و دڵنەواییان کردم، بەڵام ئەو هەواڵە بۆمن زۆر سەخت و ناخۆش بوو. بەدەم ڕشتنی فرمێسکەکانمەوە بیرم لە دوا ماڵئاوایی باپیرم دەکردەوە، ئەو زۆر دڵتەنگ بوو دەیزانی ئەگەر هەڵەیەك ڕوو بدات چیم بەسەر دێت! بۆ بەقسەی ئەوم نەکرد و لەلای نەمامەوە؟ ئەوانە هەمووی خەم و خەفەتێکی زۆر بوون خەریك بوو پێیانەوە دەتلامەوە.

پرۆسەی ئاشتی گیروگرفتی زۆری هەبوو، ناوە ناوە لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن هێرشیان دەکردە سەر یەکتر و هەریەکە ئەوەی تری تاوانبار دەکرد بە دروستکردنی گیر و گرفت و جدی نەبوون لەسەر ئاشتی. ئەو هەواڵانە بۆ ئێمە زۆر ناخۆش و سەخت بوون، بارودۆخی زیندان وەك خۆی بوو، هیچ گۆڕانکارییەك دروست نەبوبوو لە هەڵسوکەوتیان. هەرچەندە ئەو زەبروزەنگەی پێشتر لەسەر من هەبوو تا ڕادەیەك کەم بوبۆوە، بەڵام لە لایەنی دەرونی خراپتر بوو، ڕۆژانە ئازاری خۆم و هاوڕێکانم دەدرا،

ئەشـکەنجەی جەسـتەیی و دەرونـی بـەردەوام بـوو، بـۆ مـن هێشـتا بارودۆخەکـە سـەخت بـوو، ئـەوەی گۆڕابـوو کەمبونـەوەی ئـەو رقـە زۆرەی پێشـتر بـوو، کـە ئەویـش لـە ترسـی گیانـی دیلەکـەی خۆیـان دەسـتبەرداری بوبـون.

کۆبوونەوەکانـی نێـوان مەکتەبـی سیاسـی هـەردوو حیزبەکـە بـە پچـڕ پچـڕی بەردەوامـی هەبـوو، لـە هەمـوو کۆبوونـەوەکان بـاس لـە گیـراوەکان دەکـرا، بـەڵام ئەنجامـی نەبـوو. هـەر کاتێـك لێکیشـیان تونـد دەکـرد، ئـەوا خەڵکـی تریـش دەسـتگیر دەکـرا و ئێمـەش دیسـانەوە دەکەوتینـەوە ژێـر فشـار و ئەشـکەنجە. لـەو سـەروبەندەدا بـوو دوای نیوەڕۆیەکـی گەرمـی هاویـن چەنـد ئۆتۆمبێلێکـی سـەربازی هاتنـە نێـو حەوشـەی زینـدان، دوای چەنـد خولەکێـك ئەشـکەنجەدانی چەنـد کەسـێك دەسـتی پێکـرد. وا بـاو بـوو، کـە لەنێـو حەوشـە کەسـێك یـان چەنـد کەسـێك ئەشـکەنجە دەدران، دەبوایـە تـەواوی زیندانیـەکان لـە نێـو هۆڵەکـە لـە شـوێنی خۆیـان دانیشـتبان و چـوار مەشـقی روویـان بکردایەتـە دیـوار و پشـتیان لـە پەنجـەرەکان بووایـە، تـا ئەشـکەنجەدانەکە کۆتایـی دەهـات، دەبوایـە بـەو شـێوەیە و بەبێدەنگـی بیگوزەرێنیـن تەنانـەت قەدەغەبـوو قسـە لەگـەڵ ئـەو کەسـانەی تەنیشـت خۆشـت بکەیـت. ئـەو رۆژە تـا ئێـوارە ئێمـە روومـان لـە دیـوار بـوو، تـا ئێـوارە ئەشـکەنجەی ئـەو کەسـانەیاندا، کـە ئۆتۆمبێلـە سـەربازییەکان هێنابونیـان. ئێـوارە دەرگای هۆڵەکـەی ئێمـە کرایـەوە و کەسـێکیان فڕێدایـە ژوورەوە، کـە

چاوم پێیکەوت دروست وێنەی خۆم هاتەوە بەرچاو، کاتێک لە مەسیف سەلاحەدین سەیری جل و بەرگی خۆم کرد خوێنێکی ئێجگار زۆرم لێ ڕۆیشتبوو و بە جلەکانمەوە ڕەق بوو بوو، ئەو کەسەش وای لێهاتبوو تێگەیشتم، کە چەند ڕۆژێکە گیراوە و ئەشکەنجەیەکی زۆر دراوە، ئەو ڕۆژە و ڕۆژی دواییش کەس نەیتوانی قسەی لەگەڵ بکات، بەلام هاوڕێیەکم کە خەڵکی ناوچەی باڵەکایەتی بوو زوو ناسی، ئەو گوتی ئەو کەسە خەڵکی ناوچەکەی ئێمەیە. چەند ڕۆژێک دواتر لەگەڵ ئەو کەسە یەکتریمان ناسی، ئەو خۆی و دوو برای تری دەستگیر کرابوون، بەلام وەك چۆن ڕقێکی شەخسی لەبەرامبەر مندا هەبوو، بەهەمان شێوە لەبەرامبەر ئەو سێ برایەشدا هەیانبوو. چەند ڕۆژێک لە زیندانەکانی دەڤەری سۆران هێندە ئەشکەنجە درابوون، کە شوێنێکی ساغی جەستەیان نەمابوو. ئەو ڕۆژەش کە هێنایاننە ئاکرێ، بەشێوەیەك ئەشکەنجە دران زۆر دڕندانە و نامرۆڤانە بوو، بۆیە تەواوی جەستەی ڕەش و شین هەڵگەڕابوو و ئازارێکی زۆری هەبوو. ئەو ئەشکەنجەدانەی ئەو سێ برایە بۆ ئێمە کولاندنەوەی برینەکان بوو، بێ هیوابوون بوو لە گۆڕانکاری، بێ ئومێدی بوو لە ئازاد بوون و گۆڕینەوە و پرۆسەی ئاشتی، بۆ مەگەر ئاساییە هەردوو مەکتەبی سیاسی حیزبە بەشەڕهاتووەکە لەکۆبوونەوەکانیان سەرقاڵی موجامەلە و خواردن و خواردنەوە بن و ئێمەش بەم شێوەیە ئەشکەنجە بدرێین!. ڕەوایەتی لەکوێدایە

ئـەوان كۆبوونـەوە بكـەن و نامـە بگۆڕنـەوە و ستایشـی ڕۆڵـی یەكتری بكـەن، ئێمـەش هێشـتا لـە زیندانـدا بیـن و ئەشـكەنجە بدرێیـن؟!٠ بۆیـە ڕقـی ئێمـە بـۆ حیـزب و سیاسـەت و تەنانـەت خـاك و وڵاتیـش تـا دەهـات ئەسـتورتر دەبـوو٠ ئـەو ئەشـكەنجە و كەرامـەت شـكاندنە خـۆ لەسـەر دەسـتی دوژمنـە بێگانەكانمـان نەبـوو، هـەر بەدەسـتی كـورد بـوو، خـۆ تێڕوانینـی ئەوانیـش بـۆ ئێمـە نـە كوردانـە بـوو نـە مرۆڤانـەش بـوو٠ چەنـد كەسـێكمان لابـوو كـە لەسـەردەمی ڕژێمـی بەعـس زیندانـە ترسـناكەكانی وەك ئەمنـی عامـە و ئەمنـی خاصـە و بـادۆش و ئەبوغرێبیـان بینـی بـوو، بەپێـی قسـەی ئـەوان هیـچ كام لـەو زیندانانـەی بەعـس هێنـدەی زیندانـی ئاكـرێ سـەخت و ترسـناك نەبـوون٠

هەمـوو ڕۆژێـك بەڵایـەك بەسـەر ئێمـەدا دەبـاری، دەمانزانـی لـە هـەر كات و سـاتێك چێژ وەرگرانی ئەشـكەنجە لەسـەرپێن بۆ ئازاردانمان٠ خـۆ ئـازاری هەركەسـێك دەدرا جیـاوازی نەبـوو، بەڵكـو هەمموومـان ئازارەكەمـان دەچێشـت، ئەگـەر ئـازاری كەسـەكە جەسـتەیی بوایـە ئـەوا هـی ئێمـە سـەختتر بـوو و لە ڕووی دەروونیـەوە وێران دەبووین٠ ئـەو ڕۆژە پاسـەوانانی زینـدان بـۆ تێركردنـی حـەزی ئەشـكەنجەدان هـەر لـە بەیانـی زووەوە بـە گیراوەكانـی پەكەكەیانـەوە گرتبـوو٠ زۆربـەی زۆری گیـراوەكان زۆر نامرۆڤانـە ئەشكەنجە دران٠ یەكێكیان هێنـا نێـو حەوشـەی زینـدان هـەر لـە بەیانیـەوە لێیانـدا تـا دوای نیـوەڕۆ، پێیـان دەگـوت دەبـێ بڵێـی ئۆجـەلان تیرۆریسـتە، ئەویـش

نکۆڵی دەکرد و نەیدەگوت. دوای نیـوەڕۆ هەتاوێکـی گـەرم بـوو، ئەو زیندانیەیـان هێنـا سـەتڵێکی گـەورەی پاشـماوەی خۆراکـی هۆڵەکانـی تێدابـوو، بەدەسـت پێیـان بەتـاڵ دەکـردە سـەر زەوی و لـە سـەر زەویـش پێیـان دەکـردەوە نێـو سـەتڵەکە، بـەڵام ئـەو هێشـتا رازی نەبـوو لـە رێبـەر کەمتـر نـاوی ئۆجـەلان بێنێـت. بۆیـە ئەوجـارە خۆیـان خسـتە نێـو سـەتڵەکەی و سـەریان داخسـتەوە و بلۆکێکیـان خسـتە سـەر سەرپۆشـی سـەتڵەکە، تـا درەنگانـی ئێـوارە. ئێـوارە لەهـۆش خـۆی چووبـوو، ئینجـا هێنایانـە دەرەوە. ئێـوارە دکتـۆر موحسـین چـوو پشـکنینی بۆکـرد، دیـار بـوو بارودۆخـی زۆر خـراپ بـوو و بەهـۆی گەرمـا و ئارەقـەی زۆر فشـاری خوێنـی زۆر دابەزیبوو، بەڕاسـتی بەڵایەکـی گەورەیـان بەسـەر ئـەو هێنـا. ئـەو رووداوەش کاریگەرییەکـی زۆر خراپـی دانـا، پاسـەوانەکان وەك قارەمـان خۆیـان نیشـان دەدایـن و بـە سـەربەرزییەوە بەنێومانـدا دەچـوون و دەهاتـن. ئـەو رۆژە ئـەو بەندکـراوەی پەکەکـە هیچـی نەکردبـوو، بـۆ وایـان بەسـەر هێنـا؟ ئێمـە لـە هەڵسوکەوتی سـەرەتای رۆژی پاسـەوانەکان لێمـان دیـار بـوو رۆژێکـی ئاسایی نییـە، دەمانزانـی ئـەو رۆژە شـتێك روودەدات و رەنگـە بـۆ هەمووومـان سـەخت بێـت، چونکە ئەزموونـی سـاڵێکی ژیانمـان لـەو زیندانـە و لەگـەڵ ئـەو پاسـەوانانە فێـر بوبویـن، کـە لـە جوڵـە و قسـەکانیان نیەتەکانیـان بزانیـن.

ئـەم بارودۆخـە ناهەمـوارەش ماوەیەکـی دوور و درێـژی خایانـد، ماوەیەکی سـەخت و پـڕ لـە دڵـە راوکـێ، لەوماوەیەشـدا ئەشـکەنجەی

دەرونی و جەستەییمان بینی. گوێبیستی هەواڵی خۆش و ناخۆش بووین، هەندێك ڕۆژ لە دوای کۆبوونەوەکان دەیانگوت گەیشتوینەتە (مریشکە ڕەشە) و هەموو شتێك تەواو بووە. هەندێك ڕۆژیش گوێبیستی هەندێك هەواڵ دەبووین دەمانگوت ئیتر پرۆسەی ئاشتیش کۆتایی هات و هاکا لە کەپکی حەمەد ئاغا و کلاو قاسم و بەنی هەریر بوو بە شەڕ، ئەو شەڕانەی هەزارانی وەك ئێمەی کردە قوربانی، سەدان کەسی بەکوشتدا و هەزارانی ئاوارە و دەربەدەر کرد. هێشتا ترسی شەڕ لە ئارادابوو، هەمووومان پێمان وابوو لەهەر ئان و ساتێکدا دەشێ پێکدادان دروست بێتەوە. دەمانزانی نە ئاشتی تا سەرە و نە شەڕ، بەڵام ئەگەری شەڕ زیاتر بوو. بۆ ئێمەی زیندانییش شەڕ ئاگرێکی بەتینتر بوو بۆ سوتانی زیاتر، تینێك کە پێوەی دەتواینەوە. کەس هێندەی ئێمە عاشقی ئاشتی و دژی شەڕ نەبوو، چونکە پرپشکی شەڕ بەر لە هەموو کەس بەر ئێمە دەکەوت. کە ئاشتیش قۆناغێك بەرەو پێش دەچوو نەختێك ئاسودە دەبووین، هەناسەیەکمان دەدا و دەمانگوت لە ئاشتیدا ئەگەری ئازادبوونمان زۆرتر هەیە، بەڵام لەشەڕدا جگە لە ئەشکەنجە و سوتان شتێکی تر بەدی ناکەین. یەکێك لەئارەزووە هەمیشەییەکانی من سەیرکردنی یاری فوتبۆڵ بوو، مانگی شەشی ١٩٩٨ یارییەکانی مۆندیال دەستی پێکرد. بەهۆی نەبوونی تەلەفزیۆن لەهۆڵەکانی زیندان، کەسمان نەماندەتوانی یارییەکان ببینین، تەنها خشتەی یاریەکانمان لابوو.

هەمـوو شـەوێك بەتامەزرۆییـەوە چاوەڕێـی هەواڵـە وەرزشـیەکانی رادیـۆی کوردسـتانی عێـراق بوویـن و کـە ئەنجامـی یارییەکانـی ئـەو ڕۆژەی رادەگەیانـد لەسـەر خشـتەی یاریـیـەکان دەمنوسـیەوە، بـەو هۆیـەوە دەمزانـی هەڵبـژاردەی کام وڵاتـە لـە چ قۆناغێکدایـە. مـن هانـدەری هەڵبـژاردەی ئەڵمانیـا بـووم، بـەڵام کـە ئەڵمانیـا نەیتوانـی سـەرکەوێت و مۆندیالی جێهێشت، حەزمکـرد هەڵبـژاردەی فەڕەنسا جامـی جیهانـی بـەرز بکاتـەوە، لەبـەر دوو هـۆکار یەکێکیـان زۆر دژی هەڵبـژاردەی بارازیـل بـووم، دوهەمیشـیان لەبـەر خاڵـە رزگارم پێـم خۆشـبوو لـەدوای هەڵبـژاردەی ئەڵمانیـا، هەڵبـژاردەی فەڕەنسا جامـی جیهانـی بباتـەوە. بـۆ بەدبەختـی لەنێـو زینـدان و لـە نێـو پاسـەوانەکانیش تەنهـا مـن و یـەك پاسـەوان هانـدەری هەڵبـژاردەی فەڕەنسـا بویـن، ئەوانـەی تـر بەتێکڕایـی هانـدەری هەڵبـژاردەی بەڕازیـل بـوون، بۆیـە کـە ئـەو دوو وڵاتـە بونـە رکابـەری یەکتـری بارودۆخـی منیـش گـۆڕا. پاسـەوانەکان هێنـدە تونـد بـوون لـە هاندانـی بەڕازیـل وەك ئـەوە وابـوون لەنێـو یاریـگاکان ئامـادەن، یـاری کۆتایی نزیـك بـۆوە و پاسـەوانەکان هەڕەشـەیان لەمـن دەکـرد، هەندێکجـار بـە گاڵتـە تێدەگەیشـتم، بـەڵام دواتـر زانیـم کـە ئـەو هەڕەشـانەیان زۆر بەڕاسـتیە. ئـەو ئێوارەیـەی یـاری کۆتایـی تێـدا ئەنجـام دەدرا یەکێـك لـە ئەفسـەرەکان هاتـە بـەردەم پەنجـەرەی هۆڵەکـەی ئێمـە، بەدەنگێکی بـەرز بـە چاودێـری ژورەکـەی گـوت، خـوا بـکات هەڵبـژاردەی فەڕەنسـا یارییەکـە نەباتـەوە، خـۆ ئەگـەر

بیباتــەوە هاندەرانــی ئــەو هەڵبژاردەیــە شــەوێکی ناخــۆش بەســەر دەبــەن و دەبــێ وایــان لێبکــەم جارێکــی تــر ســەیری یــاری فوتبــۆڵ نەکەنــەوە. لەراســتیدا ترســێکی زۆر دایگرتــم، چونکــە دەســتڕەشــی ئەوانــم بینیبــوو و دەشــمزانی بیانــوو بەدەســتەوەدان هەڵەیەکــی کوشــندەیە. یارییەکــە ئەنجامــدرا و هەڵبــژاردەی فەڕەنســا بــوو بــە پاڵەوانــی مۆندیــال، چەنــدە دڵخــۆش بــووم بــەو ســەرکەوتنەیان، هێنــدەش دڵتەنــگ بــووم و تــرس دایگرتــم. هەمــوو خولەکێــك چاوەڕێــی ئــەوە بــووم دەرگا بکرێتــەوە و بانگــم بکــەن و تــوڕەیــی دۆڕانــی هەڵبژاردەکەیــان بــە مــن بڕێــژن. ئــەو شــەوە وەك ئــەوەی شــۆك بوبــن یــان بیریــان چوبێتــەوە، کەس نەهــات و منیش تا بەیانی خــەوم لێنەکــەوت لەترســی لێــدان. رۆژی دواتــر هــەر پاســەوانێك لەوێــوە دەڕۆیشــت هەڕەشــەیەکی لەمــن دەکــرد، زۆرجــار پێکەنیــن دەیگرتــم و نەشــمدەوێرا پێبکەنــم، چونکــە دەمزانــی پێکەنینــی مــن ئــەوان زیاتــر پەســت دەکات و ئەگــەری ئەشــکەنجەدانم زیاتــر دەکات، کــە بیریشــم دەکــردەوە زۆرم بــەلاوە ســەیر بــوو دەمگــوت خــۆ مــن کەســوکاری زەمینەدیــن زێــدان نیــم، کــە ئــاوا رقیــان لــێ هەڵگرتــووم. ئــەو هەڕەشــە و چــاو ســورکردنەوانە دوو رۆژی خایانــد، بــەڵام نازانم چــۆن بــوو گوزەریــان لێکــردم و ئــەو جــارەش رزگارم بــوو.

رۆژەکان تێدەپەڕیــن و ئێمــەش لەچاوەڕوانــی ئازادبوونــدا بوویــن، بێتاقــەت بوویــن لــە هەواڵــی کۆبوونەوەکانــی لیژنــەی بــاڵای ئاشــتی! هەمــوو کۆبوونەوەیــەك بــە شــێوەیەکی تــر قســەی کۆبوونــەوەی

پێشـووتریان دەکـردەوە٠ .ئێمـە چاوەڕێـی کـردار بوویـن، هیـچ کردارێکیـش هێنـدەی هەنگاونـان بـۆ ئازادکردنـی ئێمـە گرنـگ نەبوو لامـان٠ پێمـان وابـوو ئازادکردنـی ئێمـە کۆمەڵێـك دەرگای تـر بـۆ پرۆسـەی ئاشـتی دەخاتـە سـەر پشـت و ڕەنگـە یارمەتیـدەر بێـت بـۆ ئاشـتەوایی تەواوەتـی، لەراستیشـدا وابـوو پرۆسـەی ئاشـتی بـێ ئازادکردنـی بەندکـراوەکان مانایەکـی نەبـوو٠

کۆتایـی مانگـی ئابـی ١٩٩٨ هەواڵـی ئـەوە هـات، کـە لـە نزیکتریـن کاتـدا وەجبـەی دووەمـی بەندکـراوان دەگۆڕدرێنـەوە٠ هەواڵێکـی دڵخۆشـکەر بـوو، بـەڵام هێشـتا دڵنیـا نەبوویـن ئاخـۆ تەنها هەواڵێکە یاخـود کـرداری بـەدواداێ؟ ٣١ی ئابـی ١٩٩٨ لیژنەیـەك لـە مەسـیف سـەلاحەدینەوە هاتـە زینـدانی ئاگـرێ، دوانیـوەڕۆ نـاوی سـەد و پەنجـا و پێنـج کـەس خوێندرایـەوە، نـاوی منـی تێـدا نەبـوو٠ ئـەوەش دیسـان بـۆ مـن کارەسـاتێکی تـر بـوو، چونکـە دەمزانـی تـا جارێکـی تـر چەنـد کەسـێك دەگۆڕدرێنـەوە چەنـد مانگێکـی تـری بەسـەردا تێدەپـەڕێ٠ بەڕێوەبـەری زینـدان لـە پەنجـەرەی ئێمـەوە نزیـك بـوو، بانگـم کـرد و پێمگـوت ئەگـەر نـاوی منـی تێدا نەبێـت بـە دڵنیاییـەوە ئامۆزاکـەت بەرنابێـت و دەیگێڕنـەوە، خۆتـان دەزانـن ئێمـە کراویـن بـە بەدیلـی یەکتـر، هـەر کامێکمـان کێشـە بـۆ ئازادبوونـی دروسـت بێـت بـۆ ئـەوی تریـش دروسـت دەبێـت٠ بەڕێوەبـەر گوتـی پێدەچـێ کێشـەیەکی تەکنیکـی هەبێـت خـۆم چوومەتـە مەسـیف و ڕەزامەندیـم وەرگرتـووە، کـە بەیانـی ئێوەش

ئاڵوگۆڕ بکەین. لە لیستەکەی یەکێتیش وا دەستنیشانکراوە، کە ئێوە بەدیلی یەکترین، بۆیە ئێستا هەوڵی چارەسەرکردنی دەدەم. ئەو رۆیشت و من بڕوام بەوە نەبوو، کە بتوانێت چاکی بکات، چونکە سێ مانگ زیاتر بوو بەدیلەکەی من ئامادە کرابوو، بەڵام لە مەسیف رەزامەندییان نیشان نەدەدا، کە لەبەرامبەر ئەوی دیلی شەڕ من ئازاد بکەن، بۆیە بێ هیوا بووم. دوای کاتژمێرێک بەڕێوەبەر بەرەو پەنجەرەی هۆڵەکەی ئێمە هات و گوتی: پێمگوتی، کە کێشەیەکی تەکنیکی هەیە، ئەوە چارەسەرم کرد و تۆش خۆت ئامادە بکە و بەیانی ئازاد دەکرێی.

ئەو شەوە هیچ کەسێك لەو زیندانە خەو نەچووە چاوی، ئەوەی لە خۆشی ئازادبوونیدا نەیدەتوانی بخەوێت، ئەوەی تریش لە دڵتەنگی مانەوە و ئازاد نەبوونی. من لە دڵتەنگەکان بووم بە دوو هۆکار، هۆکارێکیان ئەوە بوو، کە پێموابوو ئازاد ناکرێم و کەیسەکەی من کێشەی تێدایە، هۆکاری دووەمیش ئەوە بوو، کە هاوڕێیەکی زۆر ئازیزم (سامان) ناوی لە نێو ئازادکراواندا نەبوو. لەگەڵ سامان چەند مانگێك هاوڕێی زۆر نزیك بووین، پێکەوە نانمان دەخوارد. ئەو کوڕێکی خوێنشیرین و دەم بەخەندە بوو، زۆر سێبووریمان بە یەکتری دەهات، حەزی لە قسەی خۆش و نوکتە و بەسەرهاتی خۆش بوو، خەتێکی جوان و خۆشی هەبوو. ناوە ناوە لە دەفتەرەکەی مندا شتێکی دەنووسی وەك یادگاری، بەردەوام یەك پاکەتی جگەرەمان هەڵدەپچڕی و هەموو شتێکمان

پێکەوە بوو. زۆر نیگەران بووم کە ناوی ئەوی تێدا نەبوو، بەڵام دەبوایە لەیەك دابڕێین و هەردووکمان هیوا بۆ ئەوە بخوازین کە لەدەرەوە یەکتر ببینین. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار پاسەوانەکان هیچ فەرمانێکیان نەدا کە کەس بخەوێت یان چی بکەین، تا بەرەبەیان دەنگی گۆرانی گوتن و شادیمان دەبیست. لەراستیدا من هێندە دڵتەنگی سامان و هاوڕێکانی ترم بووم، بڕواناکەم ئەو شەوە بۆ جارێکیش زەردەخەنەیەکم کردبێ.

بەرەبەیان چەند پاسێك هاتنە نێو حەوشەی زیندان، وەك رۆژی پێشوو لیستی ناوەکان خوێندرانەوە، دواکەس، کە ناوی خوێندرایەوە من بووم، لەگەڵ سامان باوەشێکی توندمان بەیەکدا کرد وماڵئاواییمان لە یەکتری کرد. سامان لە نێو دەرگا قورئانێکی بچوکی هێنا و خستیە نێو دەستم، گوتی با بە یادگاری لات بمێنێ، چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بوون، دیسانەوە ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد و بەرەو پاسەکە رۆیشتم.

ئەو ماوە دوور و درێژەی لە زیندانی ئاکرێ بووم، دوو خزمی زۆر نزیکی خۆشم هەر لەوێ گیرابوون، ئەوان برای یەك بوون و لەیەکتری دوور خرابوونەوە، عادل لە هۆڵی دوو بوو و حەسەنیش لە هۆڵی چوار، بەهیچ شێوەیەك بۆ ئەو ماوە دوور و درێژە رێگەیان بە هیچ کاممان نەدا پێکەوە قسە بکەین و لە نزیکەوە یەکتری ببینین، تەنها جارجارە بەدزیەوە سلاوێکمان لە یەکتری دەکرد. ئەو رۆژە کە دەرگا کرایەوە و بەرەو پاسەکان چووین

عادل و حەسەنم لە نزیکەوە بینی و ڕێگەیاندراین باوەشێك بە یەکتری دابکەین و نەختێك لەگەڵ یەکتری بدوێین.
ئەو پاسەی منیان لێ سوار کرد تەنها سێ کەسی تری تێدا بوو، پاسەوانێك لە پێشی پاسەکە سەرکەوت، کاغەزێکی گەورە لکێنرابوو بە جامی پێشەوەی پاسەکە و ژمارە ٨ خرابوو سەری، واتا پاسی ژمارە هەشت. ئێمە دوایین ئۆتۆمبێل بووین. تا نێو بازاڕی شارۆچکەی مەسیف سەلاحەدین پاسەکان نەوەستان، لەوێ وەستان و ئەو سێ زیندانیەی تری نێو پاسەکەی ئێمەیان دابەزاند و بردنیانە نێو پاسەکانی تر، دواتر سێ زیندانی تریان هێنا، کە بینینم ناسینمەوە و هاوڕێی نزیکی باوکم و مامم بوون. ئەوان هەرسێکیان فەرماندەی سەربازی گەورە بوون لە نێو یەکێتی، لە دوا شەڕدا بەدیل گیرابوون و بێ سەروشوێن بوون، وادیار بوو لەگەڵ ئێمە ئازاد دەکران. لەگەڵ ئەوان ویستم گفتوگۆ بکەم، خۆم پێناساندنەوە، ئەوان گوتیان ئەوکاتەی دەستگیر کرای ئێمە چوینە ماڵی باوکت، کەسوکارت بڕوایان وانەبوو بە زیندویی بتبیننەوە، بۆیە ئەوانیش خۆشحاڵی خۆیان نیشاندا، کە منیان بینی و پێکەوە ئازاد دەبین. دوای ئەوەندە گفتوگۆیە، پاسەوانەکە گوتی ئیتر قسە لەگەڵ یەکتر مەکەن و بێدەنگ بن. بە بێدەنگی دانیشتین و تا گەیشتینە نزیك هێڵی تەماسی نێوان زۆنی سەوز و زەرد. لەوێ بارەگایەکی هێزی ئاشتیپارێزی (PMF)ی لێبوو، ئەوێ شوێنی گۆڕینەوەی دیلەکان

بوو٠ هەموومانیان لە پاسەکان دابەزاند، یەکێك لە بەرپرسەکان وتارێکیدا و نەفرەتی لەشەڕ کرد و هیوای خواست، کە ئێمە ئەو نەهامەتیانە لەبیر بکەین!٠ دوای وتارەکەی ئەو بەرپرسە، جارێکی تر ناوەکان خوێندرانەوە، ئێمە ئەو چوار کەسە جارێکی تر خراینەوە پاسێك، پاسەکەی ئێمە نازانم بۆ رووی کردبۆوە هەولێر؟! ئەوانی تر هەموویان روویان لە شاری کۆیە بوو٠ ئەوان کەوتنە رێ، پێدەچوو ناوەکانی ئێمە کێشەی تێدا بوبێت٠ توشی دڵە راوکێیەکی زۆر هاتین و لەماوەیەکی کورتدا چەندین خەیاڵمانکرد، تا ئەوکاتەی هاورێ(عەزیز محەمەد) گەیشتە ئەوێ، هاورێ عەزیز محەمەد سکرتێری پێشووی حیزبی شیوعی عێراق بوو، ئەو وەکو کەسایەتییەکی ئاشتیخواز و بێلایەن لەنێوان هەردوو لایەنی شەرکەردا، رۆڵێکی زۆر گەورە و مێژوویی بینی لە هەوڵی ئاشتەوایی لەنێوان یەکێتی و پارتیدا، کە دڵنیام مێژووی کورد بۆ هەتا هەتایە ناوی هاورێ عەزیز محەمەد لە لاپەڕە پرشنگدارەکاندا تۆمار دەکات، چونکە بە تەواوی رۆڵی کەسایەتییەکی ئاشتیخوازی بەرجەستەکرد، بە دڵنیاییشەوە ئەوە سروشتی کەسایەتی هاورێ عەزیز محەمەد بوو٠ هاورێ عەزیز هەر لەوێ پرسیاری ناوی ئێمەی کرد و دڵنیا بۆوە لە ناوەکانمان، دوای ئەوە پاسەکەمان پێچی کردەوە و بەرەو کۆیە کەوتە رێ٠ لە نێو خاڵی پشکنینی PMFئێمەیان دابەزاند و چوار کەسی تر لەولاوە هێنران، چەند قسەیەکیان بۆکردین و

وادیار بوو ئەوانە بەدیلەکانی ئێمە بوون، خۆ کەسمان یەکتریمان نەدەناسی، بەڵام قەدەر وای کردبوو ئازادی هەموومان بەیەکەوە گرێدرابوو. هاوڕێ عەزیز محەمەد داوایکرد، کە ماڵئاوایی لەیەکتر بکەین، ماڵئاواییمان کرد و کەوتینە ڕێ بەرەو شاری کۆیە. لە ڕێگا هەزاران کەس وەستابوون، لەنێویاندا کەسوکاری خۆم بینی، بەڵام نە توانیمان بوەستین نە ئەوانیش منیان بینی. هاوڕێیانی من، کە پێش چەند خولەکێك بەوێدا ڕۆیشتبوون و کەسوکاری منیان بینیبوو، پێیان گوتبوون کە ئەو ئازاد نەکرا و لەگەڵ سێ کەسی تر گەڕێندرانەوە. ئەوان بەو هەواڵە زۆر دڵتەنگ بووبوون، بەڵام وەك ئەوەی هێشتا هیوایان مابێت یان بیانەوێ ئەندامانی لیژنەی ئاشتی ببینن و لێیان بپرسن، ئاخۆ بۆ من ئازاد نەکراوم، لەگەڵ ئاپۆڕای خەڵك هاتبوونە نێو حەوشەی بارەگای مەڵبەندی سێی هەولێر لە کۆیە. کە ئێمە گەیشتینە نێو بارەگای مەڵبەند سەرجەممان براینە هۆڵێکی گەورە. من خێرا خۆم گەیاندە نزیك پەنجەرەیەك کە لەسەر حەوشەکە بوو، دوای تێڕامانێکی زۆر باوکمم بینی لە دوورەوە، ئەوانەی لە دیوی دەرەوە بوون و لە پەنجەرەکەوە سەیری ئێمەیان دەکرد بە هێما بە چەند کەسێکم گوت کە باوکمم بۆ بێننە نزیك پەنجەرەکە، بەڵام خەڵکی تریان بانگ دەکرد جگە لە باوکم. دوای هەوڵێکی زۆر یەکێك باوکمی هێنایە نزیك پەنجەرەکە و یەکترمان بینی، ئینجا دڵنیا بونەوە کە من ئازاد کراوم. دوای بینینی باوکم دایکم

و خوشـك و بـرا و كەسـوكارم تێكڕایـان هاتنـە لای پەنجەرەكـە و یەكترمـان بینـی. هەندێك ڕێوشوێن گیرابوونـە بـەر، كـە ماوەیەكی باشـی دەویسـت تـا لـەو هۆڵـە دەردەچـووم، دەرگاكانیـان داخسـتبوو و چەنـد كەسێك سـەرقاڵی پڕكردنـەوەی فـۆڕم بـوون، ئێمـەش وەك باڵندەیەكـی تامـەزرۆی فڕیـن ئارامـمـان لـێ هەڵگیرابـوو تـا دەرگای هۆڵەكـە دەكرێتـەوە و دەڕۆینـە دەرەوە. یەكـەم كەسـی ئاشـنا كـە بینیـم هاوڕێیەكـی باوكـم بـوو، ئـەو كادیرێكـی پێشكەوتوی حیـزب بـوو و لەگـەڵ خێزانـی ئێمـە تێكـەڵاو بـوو، كـە منـی بینـی زۆر دڵخـۆش بـوو و باوەشـی لێـدام، گوتـی هەمـوومـان دڵتەنـگ بوویـن كـە بیسـتمان تۆیـان گێڕاوەتـەوە و ئـازاد نەكـراوی، ئینجـا زانیـم كـە هەواڵێكـی ئـاوا دراوە بـە كـەس و كارەكـەم، بۆیـە وا بەبـێ تاقەتـی لەژێـر ئـەو دارەی نێـو حەوشـەكەدا دوور لـە حەشـامەتی خەڵك دانیشـتبوون. دوای چەنـد خولەكێـك مامـە نیـازم هاتـە نێـو هۆڵەكـە و دەسـتی گرتـم و لـە هۆڵەكـە بردمیـە دەرەوە، لەپشـتی دەرگای هۆڵەكـە ئـەو ڕێكارانەیـان بـۆ ئەنجامـدام و بـەرەو باوەشـی دایكـم و باوكـم و كەسـوكارم ڕۆیشـتم. چەنـد دیمەنێكـی سـەیر بـوو! چەندیـن كـەس باوەشـی لـێ دەدام و پیرۆزبایـی ئازادبوونیـان لێدەكـردم كـە نەمدەناسـین، بـەڵام دڵخۆشـی زۆریـان پێـوە دیـار بـوو. بەهـۆی قەرەباڵغـی نـاو دەرگاكـە كاتێكـی باشـی ویسـت تـا گەیشـتمە لای دایكم و باوكم و كەسوكارم.، تـا نەگەیشتمە باوەشـی دایكـم و باوكـم هەسـتم بـە ئـازادی نەدەكـرد. چەنـد خـۆش و پـڕ لـە چێـژە

ئـازادی! نەمدەزانـی چێـژی باوەشـی دایـك و بـاوك و ئازیزانـم زیاتـرە یـان ئـازادی؟! لـە راسـتیدا توشـی شـۆك بووبـووم، توانـای قسـەكردنم نەبـوو، هێنـدە تینـوی باوەشـی دایكـم بـووم نەمدەتوانـی لـە باوەشـی بێمـە دەرێ. مامەكانـم و تـەواوی كەسـوكارم یەكـە یەكـە لەبـاوەش دەگـرت، هەسـتم دەكـرد وردە وردە ئـازار و خەمەكانـم هەڵدەوەرێـن. شـیلانی پـورم فرمێسـك و پێكەنینـی خۆشـییەكەی تێكـەڵ بـون بەیـەك، هێنـدە یەكترمـان لەباوەشـگرت كـە نەماندەتوانـی لەیەكتـر جیابینـەوە. چـاوم نەیدەگـرت سـەیری بەهـرە و بـاڵای خوشـك و بـرا بچوكەكـەم بكـەم، خۆشـی و شـادی بـە هەمـوو جەسـتەیانەوە دیـار بـوو، ئـەوان تامـەزرۆ بـوون بـە ئـازادی مـن ببینـن، ناهەقیشـیان نەبـوو، چونكـە ئەوانیـش لـە دۆزەخـدا دەژیـان. ئاخـر ماڵـی ئێمـە بەهـۆی مـن و خوشـك و بـرا گەریلاكانـم خۆشـی و ئارامـی تێـدا نەمابـوو، ئێسـتا ئـەوان هەسـت بـە ئاسـودەییێك دەكـەن. ئیتـر كاتـی رۆیشـتنە و دەبـێ بـەرەو مـاڵ بكەوینـە رێ، شـیلانی پـورم كـە هەمیشـە هاوڕێیەكـی نزیكـی بـرازا و خوشـكەزاكانیەتی، داوای لـە دایـك و باوكـم كـرد، كـە لەگـەڵ ئـەو لـە ئۆتۆمبێلێـك سـەركەوم، ئـەو زۆر تامـەزرۆی ئازادبـوون و دیـداری مـن بـوو. كـە لـە زیندانیـش بـووم نـاوە نـاوە لـە رێـی خاچی سووری نێودەوڵەتی و ئەوكەسانەی سـەردانیان دەكـردم نامـە و دیـاری بـۆ دەنـاردم، ئـەو رۆژە ئـەو تیشـێرتە رەنـگ رەساسـیەم لەبـەر كـرد كـە ئـەو وەك دیـاری بـۆی ناردبوومـە زینـدان.

وەك گوتم بەتەواوی شۆك بوبوم، لە كۆیەوە بەرەو رانیە كەوتینە ڕێ، من زۆر برسیم بوو، رۆژی پێشوو نیوەڕۆكەی لە زیندان نانم خواردبوو، تا ئەو ساتە هیچ شتێكی ترم نەخواردبوو. لە سەیرانگای چناڕۆكی قەدپاڵ هەیبەت سوڵتان داوام لە گەنجۆی هاوڕێ و شوفێرمان كرد بوەستێ تا ئاوێك بە دەم و چاومدا بكەم و پاروێك نانیش بخۆم، كە گەنجۆ وەستا هەموو ئەو ئۆتۆمبێلانەش وەستان كە كەسوكار و هاورێكانمی تێدابوون و هاتبونە پێشوازی من. شیلان گوتی نەنكت لەبەر ئەوە نەهات گوتی دۆڵمەی بۆ دروست دەكەم و دەبێ یەكەم ژەمە خواردنی ئازادی بەدەستی من بێت، كە ئەو قسەیەی كرد پەشیمان بوومەوە لە نان خواردن، قومێك ئاوم خواردەوە و كەوتینەوە ڕێ بەرەو رانیە. لەنێو ڕێگەدا كەوتمەوە بیركردنەوەیەكی قوڵ، شیلان و گەنجۆ ناوە ناوە قسەیان لەگەڵ دەكردم، ئەوان بەباشی دەیانزانی، كە بیركردنەوەكانم تەنها لەكاتە ناخۆش و سەختەكانە، بۆیە دەیانویست بە زیادكردنی دەنگی گۆرانی و قسەی خۆش و بیرهێنانەوەی یادەوەری خۆش سەرقاڵم بكەن. گەیشتینەوە شاری رانیە، نەنكم ژنە میهرەبان و سەلارەكەی بنەماڵەكەمان، وەك ئەوەی زانیبێتی لەو خولەكەدا ڕەگەمەوە بەر دەرگا، لە دوورەوە بینیم كە لەدەرگا هاتە دەرەوە، رووی كردە ئەو ئۆتۆمبێلانەی بەدوای یەكەوەن. گەنجۆ لەبەردەمیدا وەستا و منیش بەپەلە لە ئۆتۆمبێلەكە هاتمە خوارێ و بەرەو رووی

چووم. ئەو ژنێکی ئیماندار و دڵپاك و نەرم و نیان بوو، بەرلەوەی باوەشی بۆ من بکاتەوە، هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوە و سوپاسی پەروەردگاری کرد، کە منی بەو بەخشییەوە. ئینجا دەستەکانیم ماچ کرد و توند لە باوەشی گرتم، قوڵپی گریانی بەتەواوی بێهێزی کردم، نەمدەزانی لەوکاتەدا دەبێ چی بکەم، گریانی ئەو لە خۆشی ئازاد بوونی من بوو، دواتر دەستی گرتم و پێکەوە چووینە ژورێ، سفرەی ئامادە کردبوو و لە تەنیشت خۆی دایناو و یەکەم ژەمی ئازادییم لەنێوان نەنکم و دایکم و بەرامبەر باوکم و پورو مامەکانم خوارد. خودایە ئەو ژەمە بۆ هێندە بەتام بووا چێژی خواردنەکەی نەنکم و چێژی ئازادی تێکەڵ بەیەك بووبوون، ئیتر دەبێ چ چێژێك بێت کە تازە پێیدەگەم!!

ئەو چەند رۆژەی سەرەتای ئازادبوونم رۆژانی خۆش و لەبیر نەکراو بوون، تێکڕای کەسوکارم لەهەموو شار و شارۆچکەکان کۆبوونەوە، ئاهەنگ گێڕان و هەڵپەڕکێی کەسوکارم چەند شەو و رۆژێك بەردەوام بوو.

ئەو چەند رۆژە بەردەوام چیرۆکی رزگاربوونم لە دەریای ئیجە و چۆنیەتی ژیان لە زیندانی ئاکرێم بۆ کەسوکارم و میوانانم دەگێڕایەوە، لەبەرامبەریشدا گوێبیستی ئەو چیرۆکانە دەبووم کە من لە زیندان لێیان بێ ئاگا بووم، تێکڕای ئەو چیرۆکانەم بیست کە بۆ هەوڵی ئازادکرانم درابون.

خوالێخۆشبوو کاک (فەرید زامدار)ی شاعیر و نووسەر و رۆژنامەنووس هاتە بەخێر هاتنەوەم و شەوێك لامان مایەوە، رۆژی دووەمی ئازادبوونم بۆیان باسکردبووم کە کاک فەرید لەرێی نووسین و بانگەواز لە ناوخۆ و دەرەوەی ولات هەولێکی زۆری داوە بۆ رزگارکردنی من. خۆی باسی تێکرای هەوڵ و نووسینەکانی بۆکردم، لە رۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆییەکان چەندین وتاری بلاوکردبۆوە، تەنانەت لە رۆژنامەی (الحیاة) و (الشرق الأوسط) پەیامێکی مرۆڤدۆستانەی بلاوکردبۆوە و داوای لە رێکخراوە جیهانیەکان کردبوو کە بەهانای منەوە بێن.

مامم ئالان بۆی گێرامەوە کاتێك ترسی ئەوەی لادروست دەبێت کە سنورداش دەکرێمەوە لە(ستۆکهۆلم) پەیوەندی بە سەفارەتی تورکیاوە دەکات و پێیان دەڵێت ئەگەر برازاکەم سنورداش بکرێتەوە مەترسی دەکەوێتە سەر ژیانی، بەلام سەفارەت زۆر نامرۆڤانە ولامیان دابۆوە و تەلەفۆنیان بەسەردا داخستبۆوە. دووای ئەوەی سنورداش کرامەوە و بێ سەروشوێن کرام، مامم لە ستۆکهۆلمی پایتەختی سوید پەیوەندی بە خاچی سوری نێودەولەتی و رێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکانی جیهان دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە هەروا دەچێتە بارەگای (فیدراسیۆنی کۆمەلە کوردستانیەکان) و لەگەڵ هەریەکە لە (ویلدان تانری کولو) سەرۆکی فیدراسیۆن و جێگرەکەی (کەیا ئیزۆل) قسەدەکات و بارودۆخی منیان بۆ روون دەکاتەوە، ئەوانیش بەناوی فیدراسیۆنەوە نامەیەك ئاراستەی

سـەرۆكی پارتـی دیموكراتـی كوردسـتان دەكـەن و داوای ئازادكردنـی منیـان كردبـوو.
هەرچەنـدە كـەم تـا زۆر دەمزانـی كـە كەسـوكارم هەوڵـی نێجـگار زۆریاندابـوو بـۆ ئازادكردنـم بـەڵام تـا ئـەو ڕۆژانـە نەمدەزانـی هەوڵـەكان چـۆن بـوون و چـی بـوون.
ڕۆژی چوارەمـی ئـازاد بوونـم پێـش نیـوەڕۆ ئـاگادار كرامـەوە، كـە ئێـوارە سـەردانی بـارەگای مەڵبەنـدی ڕاپەڕینـی یەكێتیـی نیشـتمانیی كوردسـتان بكـەم و كۆبوونەوەیەكمـان لەگـەڵ دەكرێـت.
ئێوارە چوومـە ئـەوێ، بەرپرسـی مەڵبەنـد چەنـد قسـەیەكی كـرد و بەخێرهاتنـەوە و پیرۆزبایـی ئـازاد بوونـی لـێ كردیـن، دواتـر گوتـی كـە بەیانـی دەبـێ بچنـە شـاری سـلێمانی و كۆبوونەوەتـان هەیـە لەگـەڵ (مـام جـەلال) كـە كۆبوونـەوە تـەواو بـوو لـە كاتـیماڵئاوایی كـردن بـە توانجـەوە پێـی گوتـم (سـنورداش بەخێـر بێیتـەوە) دواتـر بـە شـێوەیەك قسـەی لەگـەڵ كـردم، كـە ئـەوان ڕازی نیـن وەك زیندانییەكـی سیاسـی مامەڵـە لەگـەڵ مـن بكـەن. بـەو قسـانەی ئـەو بەرپرسـە زۆر نیگـەران بـووم، لـە ڕاسـتیدا مـن سـنورداش كرابوومـەوە و دەسـتگیر كـرام، خـۆ ئەگـەر پێشـینەیەكی سیاسـیم نەبوایە و بەتایبەت كەسوكار و باوكم و مامم پێشمەرگەی دێرینی دانەبـڕاو نەبوونایـە، ڕەنگـە پارتیـش بـەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا نەكردبـام. خـۆ ئـەو ڕۆژەی ئێمـە سـنورداش كراینـەوە دەیـان كەسـی تریـش لەگـەڵ ئێمـە سـنورداش كرانـەوە، بـەڵام كەسـیان وەك مـن

زیندانی نەکران و کەسیشیان نەنێردران بۆ ئاگریێ. هەر لەوێ وەڵامم دایەوە و پێمگوت راستە لە سنورداشدا گیرام، بەڵام نە پیاوکوژم و نە دزیم کردووە و نە ژنم هەڵگرتووە تا لەسەر ئەو رەفتارانە گیرابم، بەڵکو لەسە ئەو یەکێتییە گیرام، کە ئێستا جەنابتان ئاوا نوێنەرایەتی دەکەن!! ئەو بەو وەڵامەی من زۆر نیگەران بوو، هەستیکرد، کە هەڵەی کردووە، بۆیە دەستی خستە سەرشانم و ویستی دڵم چاك بکاتەوە، بەڵام زۆر بە راشکاوی پێمگوت با ئەو قوربانییەی منیش بچێتە سەر خەرمانی قوربانیەکانی تری بنەماڵەکەم.

رۆژی دواتر واتا ٥-٩-١٩٩٨ بەرەو سلێمانی لەگەڵ چەند هاورێیەکم کەوتینە رێ بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکەی مام جەلال، مام جەلال لوتفێکی ئێجگار زۆری نیشاندایین و زۆر رێزی گرتین. وتارێکی پڕ سۆز و زۆر جوانی خوێندەوە، کە تێکڕای وتارەکەی بریتی بوو لە پێداگری بۆ سەرخستنی پرۆسەی ئاشتی و سارێژکردنی تێکڕای برینەکانی شەڕی ناوخۆ. لە دوا قسەکانی ئاماژەی بەوەدا، کە پێویستە ئێوە خزمەت بکرێن بۆیە فەرمانمداوە، کە هەریەکێك لەئێوە چەند مانگ لە زیندان بوبن ئەوەندە مووچەتان بەسەر یەکەوە پێبدرێت و بەپەلەش لە دامودەزگاکانی حکومەت داتانمەزرێنن، وەك قەرەبوو و پاڵپشتییێك سەر و پارچەیەك زەویتان پێ دەدەین لە شوێنی باش.

ئەو کۆبوونەوەیە زۆر جێی دڵخۆشی بوو، لەبەر ئەوەنا کە

سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان دەكەن و داوای ئازادكردنی منیان كردبوو.
هەرچەندە كەم تا زۆر دەمزانی كە كەسوكارم هەوڵی ئێجگار زۆریاندابوو بۆ ئازادكردنم بەڵام تا ئەو رۆژانە نەمدەزانی هەوڵەكان چۆن بوون و چی بوون.
رۆژی چوارەمی ئازاد بوونم پێش نیوەڕۆ ئاگادار كرامەوە، كە ئێوارە سەردانی بارەگای مەڵبەندی راپەڕینی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان بكەم و كۆبوونەوەیەكمان لەگەڵ دەكرێت. ئێوارە چوومە ئەوێ، بەرپرسی مەڵبەند چەند قسەیەكی كرد و بەخێرهاتنەوە و پیرۆزبایی ئازاد بوونی لێ كردین، دواتر گوتی كە بەیانی دەبێ بچنە شاری سلێمانی و كۆبوونەوەتان هەیە لەگەڵ (مام جەلال) كە كۆبوونەوە تەواو بوو لە كاتی ماڵئاوایی كردن بە توانجەوە پێی گوتم (سنورداش بەخێر بێیتەوە) دواتر بە شێوەیەك قسەی لەگەڵ كردم، كە ئەوان رازی نین وەك زیندانییەكی سیاسی مامەڵە لەگەڵ من بكەن. بەو قسانەی ئەو بەرپرسە زۆر نیگەران بووم، لە راستیدا من سنورداش كرابوومەوە و دەستگیر كرام، خۆ ئەگەر پێشینەیەكی سیاسیم نەبوایە و بەتایبەت كەسوكار و باوكم و مامم پێشمەرگەی دێرینی دانەبڕاو نەبوونایە، رەنگە پارتیش بەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا نەكردبام. خۆ ئەو رۆژەی ئێمە سنورداش كراینەوە دەیان كەسی تریش لەگەڵ ئێمە سنورداش كرانەوە، بەڵام كەسیان وەك من

زیندانی نەکران و کەسیشیان نەنێردران بۆ ئاگریێ. هەر لەوێ وەڵامم دایەوە و پێمگوت راستە لە سنورداشدا گیرام، بەڵام نە پیاوکوژم و نە دزیم کردووە و نە ژنم هەڵگرتووە تا لەسەر ئەو رەفتارانە گیرابم، بەڵکو لەسە ئەو یەکێتییە گیرام، کە ئێستا جەنابتان ئاوا نوێنەرایەتی دەکەن!! ئەو بەو وەڵامەی من زۆر نیگەران بوو، هەستیکرد، کە هەڵەی کردووە، بۆیە دەستی خستە سەرشانم و ویستی دڵم چاك بکاتەوە، بەڵام زۆر بە راشکاوی پێمگوت با ئەو قوربانییەی منیش بچێتە سەر خەرمانی قوربانیەکانی تری بنەماڵەکەم.

رۆژی دواتر واتا ٥-٩-١٩٩٨ بەرەو سلێمانی لەگەڵ چەند هاورێیەکم کەوتینە رێ بۆ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکەی مام جەلال، مام جەلال لوتفێکی ئێجگار زۆری نیشانداین و زۆر رێزی گرتین. وتارێکی پڕ سۆز و زۆر جوانی خوێندەوە، کە تێکڕای وتارەکەی بریتی بوو لە پێداگری بۆ سەرخستنی پرۆسەی ئاشتی و سارێژکردنی تێکڕای برینەکانی شەڕی ناوخۆ. لە دوا قسەکانی ئاماژەی بەوەدا، کە پێویستە ئێوە خزمەت بکرێن بۆیە فەرمانمداوە، کە هەریەکێك لەئێوە چەند مانگ لە زیندان بوبن ئەوەندە مووچەتان بەسەر یەکەوە پێبدرێت و بەپەلەش لە دامودەزگاکانی حکومەت داتانمەزرێنن، وەك فەرمبوو و پاڵپشتییێك سەر و پارچەیەك زەویتان پێ دەدەین لە شوێنی باش.

ئەو کۆبوونەوەیە زۆر جێی دڵخۆشی بوو، لەبەر ئەوەنا کە

بڕیاری هاوکاری و پێدانی زەوی تێدا درا، بەڵکو هەموومان دڵخۆش بووین، کە لە لایەن یەکێتی و خودی سکرتێری گشتییەوە ڕێزمان لێگیراوە و بە چاوی ڕێزیشەوە سەیری قوربانیدان و ئەشکەنجە و زەحمەتیەکانمان کراوە.

ئەو کاتە ئازارێکی زۆری چاوم هەبوو، لە زیندان بەهۆی ئەشکەنجەوە چاوی چەپم توشی خوێن بەربونێك بوبوو، ئاستی بینینشی زۆر کەم بوو، بۆیە بە باشم زانی دوای کۆبوونەوەکە خۆم نیشانی پزیشکێك بدەم. هەر دوای کۆبوونەوەکە لەگەڵ هاوڕێیەکەم چوومە لای پزیشکێکی پسپۆڕی چاو، ئەو پزیشکە پێی باش بوو هەر ئەو ڕۆژە نەشتەرگەریم بۆ بکات، چونکە زۆری بەسەردا تێپەڕیوە و خوێن لە نێو چاومدا وشك بۆتەوە، هەر ئەوئێوارەیە نەشتەرگەرییەکەم بۆ کرا.

دوای ماوەیەك بەدواداچوونم بۆ مەسەلەی ئەو مووچە و پارچە زەوییەکە کرد، بەلام بێ بەشکرام و پێیان نەدام، تێکڕای هاوڕێیانم سودمەند بوون، جگە لەمن. ئەوەش وایکرد زامەکانی زیندانی ئاگریێ لەجەستەمدا قوڵتر ببنەوە و هەندێك بەرپرسی یەکێتی لە ڕوانگەی تەکەتول و ململانێی نێوخۆیی بەبیانوی ئەوەی لە تورکیا سنورداش کراومەتەوە و دەستگیر کراوم، هەموو توانای خۆیان خستەگەڕ بۆئەوەی بێبەشم بکەن لەو قەرەبوانەی کە مام جەلال بڕیاری لەسەر دابوو. بۆیە کە تێگەیشتم من لە نێوانم دوو بەرداشی تەکەتول هاڕاوم و بە لەبەر چاو نەگرتنی

ئـەو هەمـوو نەهامەتـی و ئەشـکەنجەدان و کوێرەوەرییـەی بەسـەرم هـات، تەنانـەت لـە شـوێنێکیش دانەمـەزرام، بۆیـە بەناچاری لەنێـو بـازاڕی رانیـە دەسـتمکرد بـە کارکـردن.

ئـەو مەرگەسـاتانەی سـەرەوە کـە تێکرایـان رووداوی راسـتەقینەن، بەسـەر گەنجێکـی تەمـەن بیسـت سـاڵاندا هاتـوون و تێکرایـان لـە ماوەیەکـی کورتـدا تۆمـار کـراون، لەوکاتـەدا کـە شـەڕێکی نەگریـس و نەفـرەت لێکـراو بەرۆکـی وڵاتەکـەی دەگرێـت و هیـواو ئاواتـی گەنـج و پیـر و منداڵـی وڵاتەکـە زینـدە بەچـاڵ دەکات، ئـەو گەنجـەش دەبێتـە قوربانـی ئـەو شـەڕە. ئـەو رووداوانـە مێژوویێکـی دوور و درێـژ نیـن، بەڵکـو تەنهـا دوو دە یـەی بەسـەردا گـوزەراوە، شـاهێدی زینـدوو و بەڵگـەی ئێجگار زۆری ئـەو رووداوانـە تـا ئێسـتا و رەنگـە تـا چەنـد دەیەیەکـی تریـش بمێنـن و ئاسـەوار و دەرهاویشـتەکانی شـەڕە نەگریسـەکەش بێگومـان هـەر دەمێنـن و بـە ئاسـانی لەنێـو ناچـن.

قۆناغێـك لـە ژیانـی مـن، بریتـی بـوو لـەو چیرۆکانـەی سـەرەوە، بریتـی بـوو لـە بێزارییێکی نەبڕاوە. هەمیشـە لەخۆم دەپرسـم، نازانم درەنـگ هاتومەتـە دونیـا یـان زوو، بـەڵام دەزانـم کاتـی هاتنـم نەبوو. دەزانـم لەکاتێکـی نەگونجـاودا بەتایبەتـی ژیانـی منداڵیـی و گەنجیـم بەبـێ هەسـتکردن بـە مرۆڤبـوون تێپەڕانـد. ناشـێ بڵێـم ژیانـم کـرد، چونکـە ژیـان چەندیـن مانـای جوانـی هەیـە، ئـەو راسـتیەش دەزانـم ژیـان بـۆ هەمـوو مرۆڤێـك پڕیەتـی لـە هەڵبـەز و دابـەز، پڕیەتـی لـە

خۆشی و ناخۆشی و پڕپەتی لە سەرکەوتن و شکست، بەڵام ناکرێ خۆشمان لەوە بشارینەوە، کە ژیانی تاکی کورد جیاوازتر بووە لەهەر مرۆڤێکی سەر ئەم گۆی زەویە. بەڵێ لە نێو میللەتانی تری دونیا خەبات لەسەردەمی کۆیلایەتییەوە دەستی پێکردووە و شۆڕشی گەورە ئەنجامدراوە. بەڵێ شۆڕش لەپێناو وڵات و ئازادی زۆر و زەوەندن. گەلی کوردیش شۆڕشی زۆری کردووە، بەڵام شۆڕشەکانی ئێمە سەختتر و دژووار تر دێنە بەرچاو. مێژوو وەك خۆی نووسراوەتەوە و دەشنوسرێتەوە، شۆڕشەکانی ئێمەش وەك تێکڕای شۆڕشەکانی دونیا، بێ کەموکوڕی نەبوون، بەڵکو لێوان لێون لە خیانەت و شکست، پڕن لە بێ هیوایی. زۆر جاریش شۆڕش مەرگەساتی بۆ میللەتەکەی خوڵقاندووە و تەواو پێچەوانەی ئامانجی خۆی و گەلەکەی ڕۆیشتووە. ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ با وەك نمونە بێنینەوە بەرچاومان و بپرسین ئایا ئامانجی ڕاپەڕین ئەوەبوو دوای تەنها دوو ساڵ شەڕی براکوژی دروست بێت؟ ئایا ئامانجەکانی ڕاپەڕین بەرهەم هێنانی دەسەڵاتێکی بێزارکەر بوو بۆ میللەتەکەی؟ ڕاپەڕین بۆ ئەوە کرا میللەتی کورد لەژێر سایەی حوکومڕانی خۆبەڕێوەبەریدا بێت و گەنج و لاوی وڵاتیش پارێزگاری لێبکەن و خۆشیان پارێزراو بن. بەڵام دوای تەنها دوو ساڵ لە سەرکەوتنی ڕاپەڕین حیزبەکان کەوتنە گیانی یەکتری و شەڕێکیان بەرپاکرد، کە توێژێکی گرنگی کۆمەڵگا یان چەك بکاتە شانی و بەرامبەر براکەی بجەنگێت

یان ڕێگای قاچاغ بگرێتەبەر و خۆی رادەستی قەدەر بکات و لەهەوڵی ئەوەدابێت مەملەکەتێکی تر بکاتە نیشتمانی خۆی.!!
ئەو سەردەمە وەك بەشێکی زۆری گەنجانی وڵاتەکەم منیش بێزار بووم، تروسکاییێکم بەدی نەدەکرد، کە لەژێر ئاڵا و لەسەر خاکی خۆم بتوانم ژیانێکی ئاسایی بژیم و بیر لە بەدیهێنانی خەونەکانم بکەمەوە. بێزاری من لەدەست شەڕێکی خوێناوی نێوان براکان بوو، لەدەست تەق و تۆقی چەکە قێزەونەکان بوو، من و هەزارانی وەك من نەماندەویست گوێ لە داستانەکانی سێبیران، کەسنەزان، زینی وەرتێ، بەنی هەریر، کەپکی حەمەدئاغا و کلاو قاسم بگرین. نەماندەویست چیتر چەك هاوڕێمان بێت و ببینە پاڵەوانی براکوژ، نەماندەویست مەرگی هیچ گەنجێك ببینین لەسەر چەند بستێك ئەرز و تەپۆلکە و گردە روتەڵانەکان. بەرگەی بینینی تەرمی دەیان کەسمان نەدەگرت، کە لە نیوەشەودا کۆمەڵکوژ دەکران، چیتر نەماندەتوانی بە دیار شاشەی تەلەفزیۆنەکانەوە دانیشین و دیمەنی وێرانکردنی ئەم وڵاتە ببینین، بەڵێ نەماندەتوانی گوێ لەلاوانەوەی دایکە جگەر سوتاوەکان بگرین و منداڵی بێنازی قوربانیەکانی ئەو شەڕە ببینین. ئەودەمە شەڕ تەنگی بەهەمووومان هەڵچنیبوو، هەموو خەون و خولیای مرۆڤیان زیندە بەچاڵ کردبوو و وڵات هێندە ناشیرین کرابوو، کە جگە لە بۆنی خوێن و باڕوت بۆنێکی تری لێنەدەهات.

ئێستا نزیك بە سێ دەیە بەسەر ئەو رووداوانەدا گوزەریان کردووە، دوو دەیە زیاترە شەڕی ئاشکرای براکان وەستاوە، وڵات رەنگ و بۆنێکی ساختەی پێوە دیارە، کە پێی دەڵێن ئاشتی و پێکەوە ژیان. با بەراوردێك لەگەڵ ئەوسا بکەین و بزانین چی گۆڕاوە، بێگومان بەرواڵەت زۆر شت گۆڕاوە، بەلام لە ناوەرۆکدا هێشتا جەستەی شەڕی ناوخۆ بۆگەنێکی بێزارکەری لێدێ، هێشتا ئەو شەڕە درێژەی هەیە لەژێر ناو و رەنگی تردا، هێشتا براکان سەرقاڵی یەکتر سڕینەوە و هەلا هەلاکردنی یەکترین و شەڕ بە فۆرمێکی تر درێژەی هەیە. شەڕی ئێستا شەڕی کەپکی حەمەد ئاغا و کلاو قاسم نییە، شەڕی ئێستا شەڕی گردێکی رووت و رەجاڵ نیە، شەڕی ئێستا لەسەر ریزێك دوکان و بڕینی درەختێك نییە، ئێستا شەڕەکان قەبارەیان زۆر لە شەڕی ئەوسا گەورەترە، ئەوان لەسەر کورسییێکی سەرۆکایەتی یان وەزیر و بەڕێوەبەرێك وا خەریکی یەکتر هاڕینن، لەسەر نەوت و غاز هەموو رۆژێك یەکتر دەسوتێنن، لەسەر بالادەستبوون لە زینوو و شارۆچکەیەك خوێنی یەکتر دەڕژێن، ئەوان سەرقاڵی نووسینەوەی مێژوێکی تری هاوشێوەی ئەو سەردەمەن، بەلام لەژێر ناوێکی تردا. سەنگەری یەکتر سڕینەوە و یەکتر شکاندنیان لەسەر گرد و تەپۆلکەکان گواستۆتەوە نێو سۆشیاڵ میدیا. هەموویان لەشکرێکی نادیاریان ساز و ئامادەیە و لەسەر پێن بۆ بەگژ یەکتردا چوونەوە، وەك چۆن هێشتاش خاوەنی هێزی چەکدار و

چەکی پێشکەوتوون؛ ئیتر پێدەچێ بەڵێنیاندابێت، تا دونیا ماوە نەهێڵن ئەو میللەتە ئارامی بەخۆیەوە ببینێ؛ دەرهاویشتەی ئەو شەڕە ناراستەوخۆیەی ئێستا هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ئەوەی ئەوسا، بگرە مەترسیدارتریشە چونکە ساڵانێکە و دوای بەرواڵەت وەستانی شەڕی براکوژی شەڕێکی تر لەئارادایە و پێی دەگوترێ(ئیرهابی فیکر)؛ بەهۆی ئەو شەڕي پەنهان و گەورەیە هێشتا پۆل پۆل هاوڵاتیان سەرقاڵی جێهێشتنی وڵاتن، ئەوان بە ڕێگەی قاچاغدا دەڕۆن و توشی چەندین مەرگەسات و مەترسی گەورە دەبنەوە، خۆیان رادەستی شەپۆلەکانی دەریای ئیجە دەکەن و هەموو رۆژێك چیرۆکی دەیان (سافۆ) دەنووسنەوە و ئێمە و دەسەڵاتدارانیش بێباکانە دەیانخوێنینەوە؛ هێشتا خەونی بەشێکی زۆری هاوڵاتیان جێهێشتنی وڵاتە، زۆرێك بەدوای مەملەکەتێکدا دەگەڕێن تا بیکەنە نیشتمانی راستەقینەی خۆیان، چونکە کارەساتێك روویداوە کەس ئەم خاك و وڵاتە بە نیشتمانی خۆی نازانێت و ئایندەی خۆی تێدا نابینێتەوە؛ هێشتا بەشێکی زۆری خەڵك پێیان وایە پێویستە خۆیان بگەیەننە نیشتمانێك، کە تێیدا هەست بە مرڤبوون بکەن و تام و بۆنی ژیان بکەن، ئاخر کوا لەم مەملەکەتە هێشتویانە و دەهێڵن هەست بە مرۆڤبوون و ژیان بکەین!؛ دواجار مرۆڤ نابێت کۆڵبدات و پێویستە بەدوای ژیاندا بگەڕێت و ئەو شوێنە بکاتە نیشتمانی خۆی، کە تیایدا هەست بە مرۆڤبوون بکات؛



ئەو کەوچکەی زیاتر لەساڵێك لەزیندان نانم پێخوارد

INTERNATIONAL COMMITTEE OF THE RED CROSS

***DC/98/689***

***TO WHOM IT MAY CONCERN***

The International Committee of the Red Cross (ICRC) certifies that the following person:

| | |
|---|---|
| Name | CHIYA HAWAR JALAL HAMAD AMIN |
| ICRC N° | IQN-809428 |
| Nationality | IRAQI |
| Date of birth | 1977 |

was detained in Aqra Detention Place, Dohuk Governorate, where he was visited and registered by ICRC delegates on 08.10.97. He was then revisited there on 08.12.97, 15.02, 12.05 and 12.08.98.

He came to the ICRC office in Sulaymaniyah and announced that he had been released on 01.09.98.

Olivier C
Head of Sub-D

Arbil, 5 November 1998

**بەڵگەنامەی خاچی سووری نێودەوڵەتی کە دەدرا بە زیندانیان دوای ئازادبوونیان**

**INTERNATIONAL COMMITTEE OF THE RED CROSS**

هذه ترجمة النسخة الاصلية الانكليزية لشهادة الاعتقال المرقمة

DC/98/689

الى من يهمه الامر

تؤيد اللجنة الدولية للصليب الاحمر بان الشخص المذكور ادناه :

الاسم : جيا هاوار جلال حمد امين

الرقم : IQN-809428

الجنسية : عراقي

تاريخ الميلاد ١٩٧٧

قد كان مسجونا في سجن مقرة عاقلة حيث تمت زيارته وتسجيله من قبل مندوب اللجنة الدولية للصليب الاحمر بتاريخ ٩٧/١٠/٨ . ثم تمت زيارته ايضا في ٩٧/١٢/٨، ١٥/٢، ١٢/٥ و ٩٨/٦/١٢.

و قد جاء الى مكتب اللجنة الدولية للصليب الاحمر في السليمانية و اعلمنا انه قد تم اطلاق سراحه في ٩٨/٧/١

اوليفر كوتو

رئيس البعثة الفرعية

اربيل ٥-١١-١٩٩٨ .

**بەڵگەنامەی خاچی سووری نێودەوڵەتی کە دەدرا بە زیندانیان دوای ئازادبوونیان**


REPLY

AGENCE CENTRALE DE RECHERCHES
COMITE INTERNATIONAL DE LA CROIX-ROUGE
GENEVE - SUISSE

CENTRAL TRACING AGENCY
INTERNATIONAL COMMITTEE OF THE RED CROSS
GENEVA - (Switzerland)

[redacted] اللجنة الدولية للصليب الأحمر
( جنيف ـ سويسرا )

3

EXPEDITEUR - SENDER - المرسل

Prenom / Name: Shila Jalal Mohammad Amin — اسم الشخص

Nom du pere / Father's name: — اسم الأب

Nom de famille / Family Name: — اسم العائلة

Adresse de l'expéditeur / Sender's address: Suly — عنوان المرسل

Rue - localite - pays / Street - locality - country: — (الشارع ـ القرية أو المدينة ـ البلاد)

Relation / Nephew

MESSAGE FAMILIAL رسالة العائلية FAMILY MESSAGE

DESTINATAIRE-ADDRESSEE - المرسل اليه

Prenom / Name: Chiya Hawar Jalal — اسم الشخص

Nom du pere / Father's name: — اسم الأب

Nom de famille / Family name: — اسم العائلة

Adresse du destinataire / Addressee: — عنوان المرسل اليه

Rue - localite - pays / Street - locality - country: BP Aqra — (الشارع ـ القرية أو المدينة ـ البلاد)

Priere d'ecrire tres lisiblement — الرجاء الكتابة بخط واضح جداً — Please write very legibly

**نامەیەک لە پورمەوە**


NOUVELLES DE CARACTERE STRICTEMENT PERSONNEL
FAMILY NEWS OF A STRICTLY PERSONAL NATURE
Priere d'ecrire tres lisiblement please write very legibly
عائلية فقط - الرجاء الكتابة بخط واضح جداً

MESSAGE A TRANSMETTRE - MESSAGE - الرسالة

Date التاريخ

REPONSE - REPLY - الرد

Date التاريخ

**ناوەڕۆکی نامەکە**


AGENCE CENTRALE DE RECHERCHES
COMITE INTERNATIONAL DE LA
CROIX-ROUGE
GENEVE - SUISSE

CENTRAL TRACING AGENCY
INTERNATIONAL COMMITTEE OF THE
RED CROSS
GENEVA - (Switzerland)

اللجنــة الدولية للصليب الاحمر
( جنيف . سويسرا )

EXPEDITEUR - SENDER . المرســل

Prenom / Name — اسم الشخص: جيا
Nom du pere / Father's name — اسم الأب: حلوار جلال بگ
Nom de famille / Family Name — اسم العائلة: /
Adresse de l'expediteur / Sender's address — عنوان المرسل: سجن عقرة
Rue - localite - pays / Street - locality - country — ( الشارع ـ القرية أو المدينة ـ البلاد )

DP Aqra 17.2.98

Family Relation

MESSAGE FAMILIAL — رسالة العائلية — FAMILY MESSAGE

DESTINATAIRE-ADDRESSEE ـ المرسل اليه

Prenom / Name — اسم الشخص: شيروان
Nom du pere / Father's name — اسم الأب: جلال بگ محمد امين
Nom de famille / Family name — اسم العائلة: /
Adresse du destinataire / Addressee — عنوان المرسل اليه: سليمانية ـ رانية
Rue-localite - pays / Street - locality - country — ( الشارع ـ القرية أو المدينة ـ البلاد ): قرية سركبكان
مدرسة سركبكان الابتدائية

صلة القرابة

SULY / Rania

Priere d'ecrire tres lisiblement . الرجاء الكتابة بخط واضح جداً . Please write very legibly

نامەیەك بۆ مامم لەرێی خاچی سووری نێودەوڵەتی

# نـــداء

إلى:- زملائي بهيئة تحرير جريدة (الحياة) اللندنية الغراء...،
زملائي بهيئة تحرير جريدة (الشرق الأوسط) الغراء...،

تحياتي الحارة...،

لكم مني من أرض كردستان الجريحة تحيات الود و الزمالة الصحفية (مهنة البحث عن المتاعب).

ارجو أن تنشروا لي رسالتي الصحفية وكنداء لي و أحد الناجين من أعماق بحر (إيجه) بصحيفتكم (الواسعة الانتشار).

سبق و أن نشرتم نبأ غرق مجموعة من الضحايا الكورد العراقيين، بينهم النساء و الأطفال في مياه بحر (إيجه). تحت عنوان (مياه بحر إيجه تبلع المزيد من العراقيين) ثم تلتها الصحف الإقليمية و العراقية و الكوردستانية منها جريدة (برايەتی) الكوردية اليومية لسان حال (الحزب الديمقراطي الكوردستاني) العراقي، بعددها المرقم (٢٣٧٨) في ١٩٩٧/٧/٢٣ حيث نشرت تحقيقاً مطولاً و مصوراً مع عدد من الناجين من الغرق و منهم الشاب الكوردي (جيا هاوار جلال) البالغ من العمر (٢١) عاماً و قد تم اللقاء الصحفي معه في الهيئة أحد السجون الرهيبة للحزب المذكور. لأنه حال وصوله مع أصدقائه الآخرين إلى بلدة (زاخو) الحدودية المتاخمة لتركيا، تم القبض عليه من قبل الأجهزة الأمنية التابعة للبارتي لأسباب سياسية، علماً بأنني ناشدت منظمات حقوق الإنسان و الجهات المسؤولة عبر مقال بجريدة (هەرێمی کوردستان) لسان حال حكومة إقليم كوردستان بعددها المرقم (٤٤) الدورة الثانية في ١٩٩٧/٧/٣٠.

لذا اناشدكم باسمي و زملائي الشعراء و المثقفين و الصحفيين الكوردستانيين بحيوية ضميركم الإنساني الحي بكشف الحقائق أمام أنظار الرأي العام العالمي و ذلك بإجراء حملة إعلامية عالمية و على كافة المستويات من أجل إطلاق سراح الشاب الكوردي البريء (جيا هاوار) القابع حالياً تحت التعذيب الجسدي و النفسي في أحد السجون التابعة للأجهزة الإرهابية لعائلة البارزاني و حزبه، و إنني على يقين تام بأن ضميركم الإنساني المرهف من خلال واجبكم الصحفي المقدس و رسالتكم الإبداعية الحرة، تستجيب لنداء اخوتهم في الإنسانية و زملائهم في المهنة الأصيلة في جميع أرجاء العالم، من حيث الاهتمام الكبير بالحادث المؤسف لضحايا الحادث الأليم و الناجين منه خاصة، حيث كان الشاب الكوردي المذكور قد نجا من قدره المحتوم بعد صراعه المرير مع الأمواج المتلاطمة لبحر (إيجه) ثم يعود للحياة ليقبع في السجون الرهيبة للبارتي، فلو قرأتم السرد الروائي الجميل للشاب (جيا هاوار جلال) عن معايشته الحقيقية لتلك الساعات من الزمن الصعب و صراعه القاتل مع الماء و الموت المحقق،... لتذكرتم بطل رواية (الغريق) (لغابرييل غارسيا ماركيز).

تقبلوا جزيل شكري و تقديري...

زميلكم
**فريد زامدار**

شاعر و صحفي من كوردستان العراق
عضو منظمة الصحفيين العالمية
عضو الاتحاد العام للصحفيين العرب
عضو نقابة الصحفيين العراقيين
عضو الهيئة التأسيسية الأولى لنقابة الصحفيين
الكوردستانيين / غير مؤسس حالياً
عضو اتحاد الأدباء الأكراد
السليمانية
في ١٩٩٧/٨/١

صورة منه إلى:
- منظمة حقوق الإنسان العالمية
- منظمة حقوق الإنسان في العراق
- منظمة حقوق الإنسان في كوردستان/٢
- كافة المنظمات الخيرية العاملة في كوردستان العراق
- كافة الأحزاب و المنظمات المهنية الكوردستانية و العراقية المعارضة
- منظمة الصحفيين العالمية / برشلونة / أسبانيا / أحمل الهوية المرقمة ٣٥٥ في ١٩٩١/١٢/٣١
- الاتحاد العام للصحفيين العرب / القاهرة / أحمل البطاقة المرقمة ٢٢٧١ في ١٩٩١/١٢/٣١
- الصحفي الكوردي و العالمي المعروف الأستاذ كامران القرداغي.
- الأديب و الصحفي الكوردي المعروف سامي شورش/ لندن.
- ممثل منظمة الصليب الأحمر في كوردستان

**ناوەرۆکی ئەو پەیامەی خوالیخۆشبو فەرید زامدار لە ڕۆژنامەکانی الشرق الأوسط و الحیاة بڵاوی کردبۆوە**







دوای ئازادبونمان لە زیندان بە چەند ساڵێک بڕیاردرا کە وەك زیندانی سیاسی مامەڵەمان لەگەڵدا بکرێت و وەك ئەندامی کۆمەڵەی زیندانییە سیاسیەکان / کوردستانی عێراق تۆمار کراین و پێناسی ئەو کۆمەڵەیەمان پێداین، بەڵام دوای ماوەیەك بە مەبەستی سڕینەوەی ئاسەواری شەری ناوخۆ پێناسەکانمان لێ وەرگیرایەوە و لە ئەندامیەتی ئەو کۆمەڵەیە لادراین.


NOUVELLES DE CARACTERE STRICTEMENT PERSONNEL
FAMILY NEWS OF A STRICTLY PERSONAL NATURE

MESSAGE A TRANSMETTRE - MESSAGE - الرسالة

برازای خۆشەویستم چیا چاوەکانت ماچ دەکەم
لە هەواڵی ساغی و سەلامەتیت دەپرسم

Date مامت/ شیروان ٩٩٨/١/١٤ التاريخ

REPONSE - REPLY - الرد

ناوەرۆکی نامەیەکی مامم کە لەرێی خاچی سووری نێودەوڵەتی بۆی ناردبووم



من زۆر بۆت بەرۆش دەبم لەبەر ئەوەی یادەکانی زۆر لەگەڵ یەکە وە بوون
جیابوونەوەش زۆر کاری لێ دەکات چونکە زۆر بەڕێز و خۆشەویست
بوویت لام هیوادارم لەیادم نەکەیت بە زووترین کات بەیەکتر
شاد ببینەوە لەدەرەوە زیاتر لێرە لەتری بچە پێشتر
کە هاوڕێکانی دلسۆز و باوەفا بێ لێرە لەتری
مانەوەت زۆر درێژە بەلام بە خەم کەم هیوادارم ژیانێکی
خۆش ببینیتە سەر هیچ دەم و کاتێک ناخۆشی نەبینیت
لە ژیانی داهاتووتدا / ژیانێکی نوێ و بەرنامەیەکی
نوێ بۆ خۆت دابنێیت و دروست بکەیت.
بە هیوای بەسەرلێدانــــــی پشتیوانەیەکی نزیک.
لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیم بۆت هیوای تەمەن
درێژی و بەختیاریت بۆ دەخوازم - داوای لێبوردن
دەکەم بەبیرلەوە هەر کەم و کورتییەکی هەبێت.
ئەگەر دەرمانەوەش هیوام شتی باشترمان بنووسیایە. برای دلسۆزت

سامان
٣١/٨/١٩٩٢

ساتاژمێر . ٩,٢٠ ٩٥

رۆژی پێش ئازاد بوونم سامانی هاوڕێم ئەم وشانەی بۆ نووسیوم



**نامەی ئازیزێك كە لەسەر پارچە رۆژنامەیەك كە لە كێكێك پێچرابوو**

خەمەکانی زیندان نەبڕاوە بوون، کەم شەو هەبوو لە خەو رانەپەڕم، بە جەستە لەنێو زینداندا بووم و بە رۆحیش هێشتا بەرەنگاری شەپۆلەکانی دەریا دەبوومەوە، زۆرجار و تا ئێستاش بەدەنگی نیاز خەبەرم دەبێتەوە و واهەست دەکەم هێشتا بەدوای ساڤۆدا دەگەڕێت، هەموو رۆژێك کارەساتێك بەسەر زیندانیانی ئەو زیندانە رەشەدا دەهات، هەموو رۆژێك بیانوێك دەدۆزرایەوە بۆ دروستکردنی فشاری زیاتر و ئەشکەنجەدانی زیاتری زیندانیان، بارودۆخ هێندە سەخت بووبوو، کە بەڕاستی لە تاقەتی زۆر کەسدا نەمابوو، رۆژانە هەوڵی خۆکوشتن و خۆ سوتاندن هەبوو، هەمووومان بە شێوەیەك لە ژیانی خۆمان بێزار بووین، کە هەزار ئاواتمان بە مردن دەخواست.

نرخ: ٤٠٠٠ دینار